ناوی کتێب : ئەحمەدی موفتی زادە ... تروووسکیێ لە پەیامەکانی

نووسەر :عبدالقهار شێخ قادر شێخ محمد شێخ نوری گردەشینەیی
(کاک شێخ)

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم

ساڵی چاپ : ٢٠١٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٦٩ ) ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێدراوە

تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە

ئیمەیل : kakshekh@gmail.com

م: 00964 750 4915597

لـەجـەرگەی جەمی یارانی گیانی
تۆم نەبیّ هیّشتا خـۆم پیّ تەنیایە
تۆم هەبیّ تەنـها لـــە إنـفـرادی
لیّم جەمە هەرچیّ خۆشـی دنیایە

« موفتی زادە »

# ناوەڕۆك

# ئەم کتێبە پێشکەشە:

- بە رۆحی پاکی حەزرەت گیانیێ کە نووری پەیام و روخساری دونیای رۆشن کردۆتەوە .
- بە دڵی گەرم و گەشی کاك ئەحمەدی موفتی زادە کە بە هەوڵ و هیممەتی مەردانە شوێن پێی حەزرەت گیانی گرتە بەرو بە دڵ و گیانی چەشنی مەشخەڵی : دین و ژینی هەژارانی گەش کردەوە .
- بە هەموو ئەوانەی غەوواصی دەریای پەیامە ڕاستەقینەکانن و لە قوولاییدا بە دوای گەوهەری حەقیقەت دا دەگەڕێن .
- بە هەموو ئەوانەی لە دڵ و دەروون و ئەندێشەیان دا بازیان بە سەر ( أسماء و أشیاء و أحداث = ناو و شت و بەسەرهاتەکان) داوەو تەنها و تەنها هەماهەنگی لەگەڵ پەیامەکان و بنەما بنەڕەتیەکان دەکەن .

# هەڵبژاردنی کەسایەتی

## کاک ئەحمەدی موفـــتی زادە بۆ ؟

تەرخان کردنی ئەم کتێبەم بۆ کەسایەتیەکی مەزنی چەشنی کاک ئەحمەدی موفتی زادە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای تێکەڵ بوونم بە پەیام و بەرنامە و هزری ئیسلامی و ناسینی کاک ئەحمەدی موفتی زادە وەك نموونەیەکی زیندووی گەش لەم بوارەدا و، سەرسام بوونم بە ئاکاری بەرزی ئەم کەڵە پیاوە و جورئەت و رچەشکێنیەکانی لە دونیای فیکری ئیسلامیدا و، راست کردنی لەگەڵ پەیامەکان تا ئاستی گیان لەسەر دانانی و، لە هەمووان زیاتریش ئەو بێ نەفسی و تەوازوع و صدقە قووڵە دەروونیەی کە هەیبوو،کە لە دوای پێغەمبەرانەوە ژمارەیان یەکجارکەمە ئەوانەی بەم ئاستی (صدقە دەروونیە) گەیشتوون، کە دڵ و گیانیان چەشنی ئاوێنە دەبریسکێتەوە و ناوەوە و دەرەوەیان یەکسان دەبێت بەیەکتر. ناسینی ئەم مەردە پیاوە سەر لەبەر ژیان و تێڕوانینی منی گۆڕی بۆ ئایین و ژیان و گەردوون بە گشتی، فێری کردم کە ئیتر

نابێ بە تەنها چاو لە توێکڵ ببڕم ، گەر عەودالّی تام و چێژم: ئیدی تام و چێژ وا لە ناوەڕۆك و لە قوولآیی دا، فێری کردم بە تەنها لە سەر ڕوالّەتی پەیام و دەق و فەرمایشتەکان نەوەستم و بە دوای هۆکارو ئامانج و حیکمەتی راستەقینەیان دا بگەڕێم

، کە ئیتر ئەویش پێویستیان بە بیرو بینشێکی قوولّی هەمە چەشن و دڵ و دەروونێکی گەش و سەلامەت و سازگار هەیە، بۆیە من ئەم دیاری یە بچووکەم بەکەمترین وەفایەك دەزانم کە بینوێنم بەرامبەر بەم کێوە پیاوە، تا هیچ نەبێ ببێتە (صەدەقەیەکی بەردەوام) بۆ سەر کردەوە چاکەکانی لە دوا رۆژدا "إن شاء الله" ..... آمین .....

# ئەحمەدی موفـــتی زادە کیّ یە؟

کاك ئەحمەدی موفتی زادە کوڕی مەلا مەحموودی موفتی کوڕی عەللامە مەلا عەبدولاّی دشەیی یە، لە ساڵی 1933 ز لە شاری سنە لە بنەماڵەیەکی زانست خوازی ئایین پەروەردا لە دایك بووە، وەك هەموو زانا ناودارەکانی کوردستان ئەمیش سەرەتای خوێندنی بە فەقێیاتی دەست پیّ کردووە و بۆ ئەم مەبەستەش زۆربەی شارو دێهاتەکانی کوردستانی ئێران و عێراق گەڕاوە بۆ خوێندن و شارەزایی لە زۆربەی زانستەکانی ئایین دا پەیدا کردووە . هەر لە تەمەنی گەنجێتیدا لە مەدرەسەی مزگەوتی(دار الإحسان)ی سنەدا دەرسی ئایینی گوتۆتەوە و ماوەیەکیش لە زانستگای تاران بەشی زانیاری دینی دەرسی وتۆتەوە، دوو ژنی هێناوە و تەنها لەوەی دووەمیانی یەك تاقە کوڕی بەخێر لە دوا بەجێماوە بە ناوی (محەمەد ژیان).

زیاتر لە(10- دە) ساڵ زیندانی کراوە، پاش ئەشکەنجەو ئازار دانێکی کەم وێنەی جەستەیی و رۆحی لە ساڵەکانی کۆتایی زیندان و ژیانیدا

لاشەی زۆر لاوازو بێ هێز دەبێت و تووشی کۆمەڵێك نەخۆشیش دەبێت، لەوانە شکانی ئێسکی پشت ملی کە تا رۆژگاری مردنیشی هەر چاك نەبوویەوەو لە هەمووانیش دەردەدارتر دووچار بوونی بە نەخۆشی شێرپەنجە( سرطان ) کە بەهۆیەوە ئێش و ئازارێکی کەم وێنەی بووە، سەرەنجام لە ساڵی 1993 ز لە نەخۆشخانەی (ئاسیا)ی تاران کۆچی دوایی کرد و رۆحە پاك و مەزنەکەی گەڕایەوە لای خوا گیانی خۆی و جەستە بریندارەکەشی لە گۆڕستانی (شێخ حەمە باقر) لە شاری سنە بە خاك سپێردرا ..خودای گەورە لێی خۆشبێت ..... آمین ......

# چەند تیّبینی یەک

1. نووسەری ئەم کتیّبە نەیوستووە و ناشـیەویّ بانگەشـە بـۆ فیکـری هیچ کەسیّك و پەیوەستیی و پەیڕەویی لە نەهج و بەرنامەی هیچ تـاقم و گروپیّك بکات، ئەمەش تایبەت مەندییەکە و کەم کردنـەوەی نـرخ و بەها و، کاری هیچ یەکیّك لە دەستە جەمعەکان نیە، بۆیە هەرچی لـە دوو تویّی ئەم کتیّبە نووسراوە زادەی بیر و تیّڕوانینی تایبەتی(نووسـەر) خۆیەتی دەربارەی ئەو گەورە پیاوە و بـە تـەنها خـۆی لـە دانـەی بۆ چوونەکان بەرپرسیارە.
2. نووسەری ئـەم کتیّبـە لـە توانـای دا نـەبووە ئیحـاطـەی تـەواوی پەیامـەکانی ئـەم کەڵـە پیـاوە بـدات و لـە هـەموو وردو درشـتیّکی بینشەکانی بکۆڵیّتەوە و ئاشنایان بکـات بـە خویّنـەرانی، بۆیـە پیّـی خۆشـە ئـەم کتیّبـە وەك خویّندنـەوەی بەشـیّك لـە ژیـان و بەرهـەم و پەیامەکانی تەماشا بکریّت و ئەگەر هەر کـەم و کورییەکیـشی تیّـدا بینرا ئەوا بزانریّ کە هی کەم بینی و کورت بـینی خـودی نووسـەرەکە خۆیەتی.

# پێشەکی

ئێمە لە بەر دەم پێناسە کردنی کەسێکی مەزنی وەهادایین کە بە گوفتاری شیرین و رەفتاری رۆشنی مرۆڤایەتی قەرزاری خۆی و پەیامەکانی کردۆتەوە، کەسێك کە لێوان لێوە لە هاوتایی و یەکسانی بیرو دەروون :- بە ئاکار و کردەوەی رۆژانە و گوزەرانی ژیانی، کەسێك تا سەر ئێسقان خۆبەخش بۆ رزگاری و خۆشبەختی ئەوانی دی لە دونیا و دوارۆژدا، موفتی زادە ئەو مەردە پیاوە، مەزنە، خاوەن پەیامەیە کە هەموو بیرو ئەندێشە وگوفتار و رەفتاری پڕ بوون لە پەند و حیکمەت و پەیام و، هێمایەکیش بوون بۆ تێگەیشتن و پێگەیشتنی جوان و تەندروست و بەرهەمدار لە پەیامی ئایین دا، موفتی زادە ئەو رابەر و پەیام دار و حیکمەت خوان و بیرمەند و ئەخلاقمەند و عاریفە مەزنەیە کە ئەگەر بمانەوێ باسی هەر بەشێك لە ژیان و پەیامەکانی ئەو کەسایەتیە هەردەم رۆحگەشە بکەین رووبەرووی دوو حاڵەتی سەخت دەبینەوە لە هەوڵ و تێکۆشانەکەماندا، یەکێکیان ئەوەیە کە ئاسان

ئیحاطەی ناوەڕۆك و حەقیقەت و جەوهەر و گەوهەری پەیامەکانی نادرێت، چونکە بەزمانێکی رۆشن و ساکار لە رووکەشدا بەلاّم قوولّ و دەولّەمەند لە مەعنا و مەبەستدا دارِشتراون و، کاری کەسێك یان چەند کەسێکی کەم نیە لە تەواوی پەیامەکانی حالّیی بن و (ئەصلە مەطلەب)ی خۆیان بگەیەنن بە خەلّکان.

ئەوەی تریشیان هەر کاتێك بێینە سەرباسی هەر یەکێك لە پەیامە مەزنەکانی ( لە دەروونەوە ) تووشی تەریق بوونەوە و هەست بە شەرمەزاری کردنێکی گەورە و گران دەبینەوە نسبەت بەحەقیقەت و ویست و ناوەڕۆکی پەیامەکان کە داوای دەکەن لە عاشقان و پەیڕەوکارانی، چونکە بەڕاستی بۆ بەکردەوە کردنی پەیامەکان بەر لەهەر کەس لەخودی خۆماندا پێویستمان بە دامەزرانێکی قوولّی دەروونی و ئاکار و ئەخلاقێکی مەزن و راستەقینەی کردارەکی و هەولّ و هیممەت و کۆشش و لە خۆبڕان و توانەوەی دلّ و گیان هەیە بۆ رزگاری و بۆ خۆشبەختی خۆمان و خەلّکانی دی، چون مەطلەبی پەیامەکانی موفتی زادە کەمتر پەیوەندییان بەهۆش و بیرەوە هەیە و بەتەنیا بەزانین و مەعریفە واز لە دلّپەیوەستانی پەیامەکانی خۆی ناهێنێ، بەلّکو تاسەر ئێسقان داوای ئاکار و کرداری دەروونی و

جەستەیی دەکەن لە پەیڕەوانی، بەراستی موفتی زادە خۆیشی جوانترین و راسترین نموونەی بەر چاو و سەرکەوتووی هەمەچەشنەی پەیامەکانی خۆی بوو و، سەلماندیشی کەئیتر پەیامەکان شایستەی جێ بەجێ بوونن و هەر کەسێ بیەوێ مەزنیی دونیا و دوارۆژی دەسکەوێ دەبێ مەردانە قۆڵی لێ هەڵکا و شوێن و کات و تەواوی بەخششە دەروونی و دەرەکیەکانی کە پێی بەخشراوە لە خزمەت پەیامەکان دابنێ ..

# پەیام و پەیامداری

باش وایە گوێ لە هەموو کەسێ بگرین، بەڵام بڕیاری بەقسەکردنی هەموو کەسێك نەدەین، بەڵگە و نیشانە و پێشنیاری دروست و تەبا بە پەیامە ڕاستەقینەکان لە هەموکەسێك وەرگرین، باخاوەنەکەی هەڵگری بیر و بۆچوون وپەیڕە و و پرۆگرامی نا تەندروستیش بێت، لە بەرامبەردا بەڵگە و نیشانەی نا دروست و ناتەبا بە بنەما بنەڕەتییەکان و یاسا تەندروستەکان لە هیچ کەسێك قبووڵ نەکەین، با خاوەنەکەی هەڵگری پەیامی دروست و کەسایەتی گەورە و جەماوەری بێ شوماریش بێت، چون ئەوەی شتەکان و کێشەکان و ڕێگاکان بەهەق یەك لایی دەکاتەوە : پەیام ودەستوورو بنەما ڕۆشن و بەڵگەدارەکانن، نەك کەسەکان.

ئەوەی ناگۆڕێت و شوێن کات و هۆکارەکان کاریگەری نا تەندروستی لە سەر ناکەن : ڕێسا ڕۆشن و پەیامە ڕاستەکانن، نەك مرۆڤەکان .

مەبەستمان لە پەیام : بیر و بینش و رستە و دەستەواژەگەلێکە کە پڕبێ لە دەستوور و یاسا و دیاری کردنی ڕێ و شوێن و ڕێنومایی بەرز و باڵا بۆ خزمەتی مرۆڤ بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە و بەهەموو چەشن و هەموو ئاستە دەروونیەکانی مرۆڤ و بۆ هەموو سەردەمەکان بێ جیاوازی زمان و گەل و ڕەگەز و ڕەنگ و سیما و جیاوازییەکانی تر.

مەبەستمان لە پەیامکاریش : تێڕوانینی ڕاست و تەندروستانەیە لە سەرجەمی پەیامەکان و دارشتنی نەخشە و پلانی (باشترین شێوازی بە کردەوە کردن) لە جێ بەجێ کردنیاندا بەجۆرێك کە هەماهەنگ بێت بە دڵ و گیان و فیطرەت وخواستە تەندروستەکانیان و بەزەحمەتی کەم و،کات و سات لێ خەرجکردنی کەم : زۆرترین سوود و خزمەت بگەیەنێ بە مرۆڤەکان .. ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە پەیامی ئایینە، واتە مەبەستمان پێی : دارشتن و تێگەیشتنی قووڵی ئینسانییە لە چەمکە بەهادارە ئایینیەکان، ئەوانەی ڕەگ و ریشاڵیان لە قووڵایی مەبەست و ڕۆح و خواستەکانی ئایین داکوتاوە و بێ جیاوازی بیر و بۆچوونەکان دەتوانن خزمەت بە تەواوی مرۆڤایەتی بکەن گەر بیانەوێ دەستی پێوە بگرن، جا لە دونیادا ژمارەی ئەوانەی کە دەتوانن بنەمای گەورە و نەگۆڕی خزمەت خواز بەتەواوی مرۆڤایەتی دابڕێژن یەکجار

کەمن، چون ئەمە کاری پێغەمبەران و، لەدوای ئەوانیش کاری کەسانێکە کە خاوەن هۆشمەندییەکی گەورە و فراوان و خاوەن دڵ و دەروونێکی یەکجار بەرز و بالاّ و رۆشن و میهرەبان بن، کاك ئەحمەد یەکێکی ئەو زۆر دەگمەنانەیە کەتوانیویەتی ژمارەیەکی زۆر لە پەیام و بنەمای تەندروستی سوودبەخش بە دین و ژینی بنیادەم بەرهەم بهێنێ و بەرلەهەرکەس خودی خۆی پێ برازێنێتەوە و ببێتە چرایەکی درەخشانی جێبەجێ کردنی ئەو بنەما و پەیامانە بۆ دەوروبەری خۆی و، پاشان هاندەری گەرم وگەشی هەرکەسیش بێت کەبیەوێ دەستەبەریان بکات و رەنگیان پێبداتەوە لەژیان وگوزەرانی رۆژانەی خۆیدا و، بەهۆیەوە سەربەرزی دونیا و ئاسوودەی تاهەتای دوارۆژبێ، موفتی زادە لەوە حاڵیی ببوو کە مەبەست لەوەرگرتن و جێ بەجێ کردنی پەیامە ئایینیەکان رۆحی مەطلەبەکە و جەوهەر و ناواخنی خواستە ئیلاهیەکەیە، نەك رووکەش و هۆکارە مێژووییەکەی، بۆیە بەردەوام لەتێگەیشتنی چەمکە ئایینیەکان بەقووڵی بەدوای ئەصڵە هۆکاری دابەزینی پەیامەکان و چییەتی حیکمەتی فەرمایشتەکان دادەچوو، تا بزانێ لەرۆژگاری جودا و لەسەروبەندی گۆڕان بەسەراهاتنی هۆکارەکان دا چۆن مامەڵەی دروست و، خواستراوی رۆحی ئایینیان لەگەڵدا بکات.

## پەیامی: هەژار لاوێنیی

هەرکات تێربووی : بزانە هەژارێك هەیە لە برسا سکی خۆی کوشیوە، هەرکات لە ماڵەکەت گەرم بوویتەوە : بزانە کرێ گرتەیەك هەیە بای ساردی پەنجەرە شکاوەکانی، خەوی خۆشی لێ زڕاندووە، هەر کات سواری ماشێنەکەت بووی : بزانە پیادەیەك هەیە ماندوو و شەکەت بەرە و ماڵ بۆتەوە بەدەستی خاڵیی، هەرکات تەندروستیی لە باری خۆت هەست پێ کرد : بەدەم سەیری ئاسمانەوە سوپاسێك بکە و بزانە نەخۆشێك هەیە لە سەر جێگاکەی کەوتووە و کەسێکی میهرەبانی دەست ناکەوێ خزمەتی بکات، هەرکات گەنجێتی خۆت بەلاوە شیرین و جوان بوو : بزانە پیرێکی پەك کەوتە هەیە سێبووری دڵی خۆی بەگۆچانەکەی دەداتەوە، هەر کات وات بەخەیاڵ داهات تۆ هەر دەمێنی و دەژیی : بزانە مردوویەك هەیە بەغەریبیی لە گۆڕەکەی دا خەوتووە و کەس سلاوێکی لێ ناکات، بزانە ئەوەی هۆکاری مانەوەتە بەنەمریی : رەفتارە ڕوون وگوفتارە رەواکانتە..

ئەوەی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بە ئاشکرا جودا دەکاتەوە لە بیرمەند و زانا و بانگەوازکار و ڕابەرانی تر : ئەو بایەخدانە بێ

وێنەیەیتی کە لەپەیامەکانیا بەهەژارانی دەدات و ئەو بایەخ پێ دان و لە خزمەت بوونانەش وەك ئەرکێك لەدین سەیر دەکات و پێی وایە هاوکاری کردن و تێکۆشان بۆرزگارکردنیان لەستەمی چینایەتی کە هەمیشە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە هیچی کەمتر نیە لە باقی شەعائیر و پەرستشەکانی تر:

ئەی خوا تەوفێق بە: خۆم و هاورێیەم

وا کەتۆ پێت خۆشە بمرین و بژین

تێ بکۆشین و تـــەنانەت گیان بدەین

(( فی سبیل الله والمستضعفین ))

، کاك ئەحمەد پێی وابوو ئایین بۆ خزمەتی مرۆڤەکان هاتووە و بنەڕەتی ترین ئەرك و پەیامیش دابین کردنی باری گوزەرانی ژیان و ڕێکخستنی ئاسایشی دەروونی وجەستەییتیان ﴿ لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ (1) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ (2) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ (3) الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ (4) ﴾ ( قریش) بۆیە هەر کاتێك و بەهەر بیانوویەك ئەم دوو پێویستیە سەرەکیەی ژیان لە مرۆڤەکان داگیر بکرێ و

بشێوێنرێ ئیدی مانای وایە گەورەترین لادان لەبنەما و بنەڕەتی پەیامەکانی ئایین روویان داوە و هەرچی زووە پێویست دەبێت لە سەر مرۆڤەکان ئەم دوو دەسکەوت و خەلاتە خودایییە بگێڕنەوە سەردۆخی راستەقینە و سەقامگیری خۆیان، موفتی زادە پێی وابوو هەموو نیعمەت و بەخششەکانی خودا لە سەر زەوی بۆ هەموو دانیشتوانی سەرزەوی یە بە یەکسانی:

( گیانە بەحوکمی سوننەت وکتاب

بەشەر هاوشانن لەیەک داک وباب

<u>چی لە عـــەرزایە لەناو و لە ڕوو</u>

<u>بــۆ بنیادەمە هەموو بۆ هەمـوو )</u>

بەو مەرجەی مرۆڤەکان بزانن چۆنی بەدەست دێنن و چۆنیشی دابەش دەکەن لەناو خۆیاندا :

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة..29)

﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الجاثية:13) واتە دەوڵەمەندان کە سەرمایەیەکی زۆر و زیاتر لە بەشی ژیانی خۆیان لەلا کۆدەبێتەوە دەبێ بزانن کە بۆ ئەوە نیە گلی بدەنەوە و ناز و فیز بفرۆشن بەسەر مرۆڤەکانی ترا، بەڵکو بۆ تاقی کردنەوەیانە لە بەشی شوکری نیعمەت و بەخشینی بەحەققی مەردانە بەسەر هەژارانا وبەهۆیەوە شەهامەت و سەربەرزی دونیا و رزگاری و خۆشنوودی تا هەتایی دوارۆژ بەدەست بێنن، بۆهەژارانیش تاقی کردنەوەیانە لەبەشی دان بەخۆداگرتن و خۆڕاگری و قەناعەت و ڕەزامەندی و عیززەت و دڵبەرزی و خۆنەدۆڕاندن بۆ سایەو سامانی دونیا..

کاک ئەحمەد بەجۆرێك لەم پەیامە قووڵ ببۆوە گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە دەبێ ڕابەرانی دین : ژیان و گوزەرانیان هاوشان و یەکسان بکەن بە ژیان و گوزەرانی چینی خواروو و هەژارانی کۆمەڵگە و، ئەوانەش

کەدەوری ئەو ڕابەرە دەدەن بۆ گەیاندنی پەیامەکان وخزمەتی خەڵکان :
باشتر وایە گوزەرانیان لە چینی ناوەڕاست سەرووتر نەبیٚ:

( ماڵ لە ئەننازی ناوەڕاست زۆرتـــر
باوەکو وابیٚ باو بە تۆی دابیٚ
تیکەییٚ هەر شت هێلمەییٚ فەرشت
هی نەدارێکە بەش هەژارێکە )

بۆیە هەمیشە بە دۆستەکانی دەفەرموو جاریٚ لەخۆم و باشترینییشتان ڕانابینم گەر سەرپەرشتیاری گوندێك بگرینە ئەستۆ ژەمەنانێك نەخۆین لە دراوسێکەمان باشتر نەبیٚ، عەشق و خەمی هەژاران بە جۆرێك تێکەڵی دڵ وگیانی ببوو دەیفەرموو توخوا بابە هۆی هیچ شتێکتانەوە هەژاران تووشی دڵ بەخۆ سووتان و کڕووزانەوەی دەروون نەبن، بۆخۆیشی هەر لە ناوەکەیەوە بیگرە (کاك ئەحمەد) هاو دڵ و هاو ژیان بوو لەگەڵیان تا

هەموو پێداویستیەکانی زیندەگییان، چونکە ڕۆشنە کە بەکار هێنان و لکاندنی وشەی کاك لە کوردستانی ڕۆژ هەلاّتدا بۆ کەسانێك بەکار دەبردرێ کە لە چینی خوارووی کۆمەڵگا بن (ماددی و مەعنەوی)، ئەو تەنانەت هەولّی دەدا جل و بەرگیشی لە جل و بەرگی ئەوان جودا نەکاتەوە و ناو ماڵ و خواردنیشی هەر وەك ئەوان بوو، ئەو پێی وابوو ئەو بان و خوارییەی کە لە حاڵ و گوزەرانی خەڵکان هەیە هی خراپ بەکار هێنانی نیعمەت و سامانەکانی خودایە لە ناو خۆیاندا، لەوەش بان تر گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر دەوڵەمەندان بە دروستی و بە زیادەوە زەکات و صەدەقە لە ماڵی خودا دەر نەکەن و نەیبەخشنەوە بە سەر هەژاراندا و، لە هەمان کاتدا حکوومەت لە( بەیتولمال و دەخلی ماددی خۆی یەوە) لەو ئاستی بەرپرسیارێتیە نەبێ کە لە خەمی هەژاراندا بێت و سەرجەم پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیانیان دابین بکات، ئەوا دەبێ جارێکی تر و سەرلەنوێ ئیمانداران لە ناو خۆیاندا پرۆژە داراییەکەی حەزرەت گیان بۆ برایەتی پێکردنی (موهاجرین و ئەنصار) زیندوو بکەنەوە و هەموو دەوڵەمەندێك لانی کەم هەژارێك یان چەند هەژارێك بکاتە برای برابەشی خۆی و هەرچی پێداویستیە بۆی دابین بکات، بەڕاستی بۆ چارەسەرکردنی بان و خواری

ناو کۆمەڵگە ئەمە جوانترین پرۆژەیەکی (ئابووری – کۆمەڵایەتی) یە لە دوای حەزرەت گیانەوە کە کاك ئەحمەد { بە ناو نیشانی : ئیخائی ئەخلاقی}تەوصیەی ئیماندارانی دەکات.. هەمیشە بە دەمەوە چوونی هەژاران وخۆشویستنیان ولەگەڵ ژیانیان بە جۆرێك ئاوێتەی هزر و ناخ و ژیانی موفتی زادە ببوو گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی دەیفەرموو: گەر دەتەوێ خۆشەویستی لای خوا گیان و حەزرەت گیان بیت و سەر بەرزی دونیا و دوا ڕۆژ بیت دڵت پڕکە لە خۆشەویستی هەژاران :

( گیانەکەم یان مەیژە موسڵمـــــــانم

یـا ئـەگـەر ئێـژی ڕێك و راس بێژی

دڵ بەتین وگەش کە: بە عەشقی خوا،

پێغەمبـەر، قورئان، عەشقی داماوان )

بۆیە ئەگەر تەماشای دەفتەری شیعرەکان و پەیامەکانیشی بکەین دەبینین پڕە لە باس و ژیان و خەم و خزمەتی هەژاران :

! پڕ کێشی ئەکەی : خۆ هەڵ بکێشی

بـە پـوول و جـل و سـفرەو دیـواخـان

کە بەش هەزاران رووت و برسـیە

هەرچەند خۆیشت بی بێ خەتاو تاوان !

● جەرگ بڕترین دیمەنێك لە ژیانیا کە ناخ و دڵ و گیانی کاك ئەحمەدی هەژاندبێ و خەمی دونیای لە دڵ و دەروون دا کۆ کردبێتەوە، بینینی ئەم رووداوەیە کە لە شاری تاران، لە شەقامی سەعدی، کاك ئەحمەد سەرەنجی دەکەوێتە سەر ژن و پیاوێکی زۆر بە فیز لە ئۆتۆمبیلێکی یەکجار جوان و دڵڕفێنا، کە لە بەردەم دوکانێکا

وەستاون و منالێکی نوقمی ناو ناز و نیعمەتیشیان لە ناو ئۆتۆمبێلەکە جێهێشتووە و خەریکی سێو خواردنە، دوو منالّی تا سەر ئێسقان هەژار و بیٚ نازیش بە دیار ئەم دیمەنە وەستاون و چاوێکیان بڕیوەتە شتە خۆشەکانی ناو دووکانەکە و چاوەکەی تریشیان لەسەر ئەو منالّە تێرەیە کە سێوەکەی بە دەستەوەیە، بۆ ئەوەی باشتر و کاریگەرتر دیمەنەکە ببینین و دلّ و گیانی ئێمەش بێنێتە کولّ : چاکتر وایە گویٚ لە خودی کاک ئەحمەد خۆی بگرین کە لە بەشی کۆتایی دیمەنە شیعریەکەیدا دەلّیٚ :

( لەپاڵی پایەی دوکانا دوو کـــــــــوڕ

دلـــــی ڕاکێشـام ئەحـوالیان لە پڕ

تەمەنیان هەروا شەش حەوت سالیٚ بوو

بەلاّم کزۆک وەک پیری دلّمردوو

ئەمانیش یەکجار جوان و خوێنـــــشیرین

وەلـیٚ لـە ژاری هـەژاری، کـەم تین

شـــــــڕو پێ خاوس شپرز و شێواو

سەر کوڵمی ناسک لەبەر تاو سووتاو

لەزۆری تەمـــــــی{فەقر}ی لەناو چوو

کـاڵیی و تەرچکی مـــــــناڵیی گوم بوو

لە لاوە، سەیـــــــری دووکانیان ئەکرد

بـەڵام دەســــیان بۆ هیچێ نەدەبرد

نـــــــەیش ئەهاتن بۆ بەرانبەر دووکان

سەیرکەن.دیاربوو: ترســـــاندبوونیان

جـــــــار جاریش تیشکی روانینیان ئەچوو

بـەرەو دووکـــــــان و هـەرچێ تیابوو

تاو تاویش ئەبوون مات و، مـــاق ئەمان

هەناســـــەی سەردیان بەردی ئەتـەزان

جارجاریٚ خەیالٚ، وا ئەیـــــــانی برد

دەســیان بائەداو{دید دید} یان ئەكرد

جار جار بەتەكان، لەجیٚ هـــەلٚ ئەسان

دائەنیشـــــتنەو جـار جار بـیٚ تـەكـان

بە قنچكانەو، دەسی گچـــــكەو جوان

لـەژێـر چناگـە، كزو بەســـتـەزوان

زیاتر، تماشای منالٚ ناو ماشـــــــین

هـۆشـی ئەبـردن ئەی كردن غەمگین

ئەی پرسی نگای مات و بیٚ دەنگـیان

چـیە دڵـیلی گـــــۆنای بیٚ رەنـگیان ؟

بۆ ئەمان نین وەك یارۆی ناو ئوتول

وەرەنگ و بۆشناخ بە پۆشــــەن پاویل؟

ئەی زانی مرۆی تۆزێ دڵ زینــــدوو

دڵی بووچکیان بۆچیی بێ تیـــــــین بوو؟

منیش لە پەنای روانیــــــنی ئەوان

چـــــــاوێکـم بەرەو ناو مـاشێن خشـان

کۆرپەی ناو ئوتوڵ، وە تییری بەرچاو

وە دەســـــــیەوە بـوو سـێوێـکی پـاراو

جـار جار دەمێکی بۆی ئەبـــرد بێواز

هیچ نـــــــەت ئەزانی:گازە، یا نە ناز؟

لەدوای چەن جار ئەم سەرو ئەو سەر

نـــــــەختێ کەلی کرد، پەرتی کردە دەر

لە جۆگەی قەراخ شەقــــاما بەتاو

بـەرەو خوار ئەچـــــوو بۆگـەنێ رەشاو

دانیشـتوانی لاژوورووی تـــــاران

ئەشـــــــــۆن شـمەکی دووکان و مـاڵان،

جا ئەو ئـاوە تا بۆ خــــوارترئەچـێ

هـــــــــەر چڵـکـنترو بـۆگـەنتر ئـەبـێ

ئەنجا بەو ئاوە لە جەنـــــــووبی شار

گشـتێکــــــیـان ئەشۆن مەردمی هەژار

سێو تلێرەو بوو بـــۆ ناو جـــۆگەلە

دوو کـوڕپەی ئازیز هەڵسان بە پـــەلە

هەرچێ خەم دنیاس لە دڵیان دەرچوو

ئەت وت دنیای وان، هەر ئەو سێوە بوو

لەم بەرو لەو بەر جـــــــۆگەوە وەغار

لەتەک سێفەکا ئـــــەچوون بەرەو خوار

ئـاخری، یەکێ لە شێرە کـــــــــوڕان

سـێوی لاکـەلی لـــــــەدەس ئـاو فڕان

بەحاڵێ بۆخۆی گازێـکی لـــــــــێ گرد

ئەنجا بەرەو لای دەم هــــــاوەڵی برد

بە روانینی پڕ خوەشـــــــەویسی و ناز

{ئـاوی حەیات} یـــان ئەدا نۆرە گاز

دای وە{مەحەببەت} جـەڵاو ئیـعتـیبار

بزە گەل جوانتر لە خونچەی وەهار

چەت بۆ بێژم لەو مەنزەرە، ئەو سات

چـەگـــەلم ئەدیی و، بـەدڵا ئەهات

ئەونە ئەزانم : بێ خـــــەوەر لە هەر

رەسم و یاسایێ، رۆژ ڕەشیی بەشەر

لایێ داماویی و خەفەت هـــــەژاران

لایێ سەر مەستیی لە خۆشیی هاران،

لە تەک فرمێسکا، زوان کەوتە گەڕان:

بــە قـــــــوربانتان بم رۆڵە گیانەکان

لە کوڵێ کڵپەی دڵێ، دەنگێ هاتە دەر:

تف لە قانـــوون و بەرنامەی بەشەر )

● تێبینی: برێ لەو پەیامانەی لێرە نوسراون دەستەواژەو دارشتنیان هی منن، وەلێ لە جەوهەر و مەعنادا هەر بە هی رۆحی درەوشاوەی موفتی زادە یان دەزانم ...

## پەیامی: دۆستایەتی

هەمیشە چاوەڕوانیت لە بەرامبەرکەت (بەتاڵ) بکە و لەخۆت دا (پڕ)، بەواتا چاوەڕوانی کەمترین هەنگاوی باشیی لە دۆستەکەت مەکە، بۆئەوەی ئەگەر بچووکترین چاکەی لەگەڵ تۆ ، یان هەر کەسێکی تر لێ وەشاوە، خۆی و چاکەکەت لەلا گەورە بێت و ستایشی بکەی، لەبەرامبەریشدا ئومێدی زۆرترین خێر و چاکەت لەخۆت داهەبێت بۆ دۆستەکانت .. بەپێی توانا و بۆ ڕەخسان : کەمترین درێغی لەم ئەرکەت مەکە، بۆ ئەوەی هەرکات بچووکترین کەمتەرخەمی لە گوفتار ورەفتارەکانت ڕوویاندا بۆ خزمەتی دۆستەکانت: گلەیی لە خۆت بکەیت، دەتوانین بەم نموونەیە ئەم پەیامە ڕۆشنتر بکەینەوە:

(وای دابنیێ دۆستێکت پێویستی بە هاوکاری و سەرمایەی دارایی تۆیە (بەخۆڕایی) بۆ پێویستیەکانی ژیانی و، تۆش بە ئەوپەڕی توانای خۆت سەرمایەی خۆت دەخەیتە خزمەتیەوە بەخۆڕایی وبیێ بەرامبەر، پاشان رۆژگار وا وەردەچەرخیێ تۆ پێویستت بە هاوکاری دارایی ئەو دەبێت (بە قەرز) بۆ پێداویستیەکانی ژیانت و، ئەویش بەهیچ شێوەیەك نەك هەر بەخۆڕایی وخەلات نا، بەلکو بە قەرزیش نایەتە پێشیێ، ئەو دەمە تۆ کەخاوەنی ئەو بنەما وپەیامەی :- ئەم هەلۆێستەی ئەو تووشی شلەژانی دەروونی و پەرچەکرداری ناتەندروست و بڕیاردانی ناشایستەت ناکات، چونکە ئەو کاتەی ئەو دۆستەت پێویستی بە هاوکاری تۆ هەبووە: تۆ بە ئەرکی پەیامدارانەی سەر شانی خۆت هەلساویت کە چاوەروانیت لەخۆتدا پرکردووە و ئومێدی زۆرترین خەیر وچاکە و هاوکاریشت بۆ بەرامبەرەکانت بە خۆت هەبووە و بەکردەوەش راستیی هەلگرتنی ئەم پەیامەت لە دەروونی خۆتا سەلماندووە، لە بەرامبەریشدا وەختیێ تۆ پێویستت بە هاوکاری ئەو بووە و پەیامدارانە و وەفادارانە نەهاتۆتە پێشیێ: هیچ سەراسیمەیەك دلێ وگیان وهەست و هۆشت داگیر ناکات، چونکە زووتر چاوەڕوانی هەلۆێستی گەورە و کرداری بالات نسبەت بە دۆستەکەت کوژاندۆتەوە لە دەروونی خۆتا،

تەنانەت گلەییشی لیّ ناکەیت، چونکە توّ کەسیّکی پەیامداری و لەوە تیّگەیشتووی کە گرنگ ئەوە نیە دوّستەکانت چاکە ناکەن، بەلّکو گرنگ ئەوەیە خراپە بە دەست و دلّ و زمانیان نەکەنە پیشەی هەمیشەیی خوّیان. ئیدی بەمە ئاسان دەتوانی دلّنەرم بیت لە بیّ هەلّویّستی دوّستەکانت و، ئاسانیش دەتوانی رق وکین هەلّنەگری لە دەروونتا بەرامبەر خەلّکی.

.

● (چاکە)ی بچووکی خەلّکیت لەلا گەورە و (خراپە) ی گەورەی ئەوانت لە دلّدا بچووك بیّ، لە بەرامبەردا (باشە) ی گەورەی خوّت لەلا بچووك و(خراپە) ی گچکەی خوّت لە دلّ مەزن بیّت، بەم پەیامە دەتوانی بوّ (چاکە) ی بچووکی بەرامبەرەکانت ستایش بنیّری ولە (خراپە) گەورەکانیشیان ئاسان ببووری، لە بەرامبەریشدا بوّ (باشە) مەزنەکانی خوّت فریوی نەفس وشەیتان نەخوّیت و لە (خراپە) بچوکەکانیشت ئاسان نەبووری ..کاك ئەحمەدی موفتی زادە تەواوی ئەم دوو پەیامە مەزنەی لەم چەند دیّرە شیعرە کورت کردوّتەوە :

ا گیانە پێت خۆشە موسڵمانێ بی

خۆشەویستی خـــــواو هەرکە إنسانە

خاسی خەڵك نەختێ، بەفرە بگرە

چاکـــــــەی خۆت زۆری، بەکەم بزانە

عەیبەی خەڵك لات کاوێ کایێ بێ

تۆزکاڵێ لەخـــۆت بە کێـــــــوی دانە

توقع لەخـۆ زۆر، لەمـەردم کەم

سەرمایـەی بـەرزی هـەردوو ژیـانە ا

● هەمیشە دۆستایەتی کەسانێك بکە هەقیان لەتۆ خۆشتر بووێ.

● هەتا دەتوانی گوناهەکانی خۆت، کەموکوڕی ونالەباری و رەوشتە ناشایستەکانی خۆت، لەلای کەس باس مەکە وکەسیش بە فریادڕەس مەزانە بۆچارەسەری کێشەو تاوانەکانت، پەشیمانیی ئەو فریادڕەس و دادوەرە زۆر دڵسۆزەیە کە ئاشتت دەکاتەوە لەگەڵ هەق وراستیدا.

● بتوانە یەکێك یان چەند کەسێکی کەم هەڵبژێری بۆ ئەوەی نهێنیەکانی خۆتیان لەلا بدرکێنی، ئەویش لەدوای چەندین تاقی

کردنەوەی لیّ دەرچووی دۆستەکانت، چون ژمارەیان یەکجار کەمە ئەوانەی دەتوانن نهیّنی پاریّز بن لە خۆشی وناخۆشیدا، لەتوورەیی و لەخۆشەویستیدا .

● با عەقلّ چاودیّری گوفتار و بڕیارەکانت بیّت، بەلاّم رەفتارەکانت نوقمی سۆز و میهرەبانی بکە، هاوتەبابوونی عەقلّ و دلّ، شت و مانا، لەیەك کات دا و لەیەك مرۆڤدا شتیّکی موستەحیل نییە.

● وەختیّ چاکە لەگەلّ دۆستەکەت دەکەی چاوەڕوانی پاداشتی لیّ مەکە، تەنانەت سوپاسیّکیش، ئەو دەمە ئەگەر لەجیاتی چاکە بیّ وەفاییشی لەبەرامبەر نواندی، گلەیی لیّ ناکەی، ئەگەر گلەییشت لیّکرد لەبەر خۆیەتی و بۆ دانەبەزینی ئاست و پلە و نمرەی مرۆڤییّتی خۆیەتی، نەك لەبەر چاکەکانی خۆت کە لەگەلّتدا کردوونە، کە ئەمەشیان هەر چاکەیەکی تر و هاوکاریکردنیّکی ترە لەگەلّیدا.

● لەگەلّ هاوڕیّکەت هەمیشە لەسەر ئەو بابەتانە بدویّ کە تەبایی و هاوکۆکیتان هەیە لەسەری، ئەگەر بابەتە ناکۆکەکان هاتنە پیّشیّ خۆتیان لیّ لادە، بەسەلامەت هیّشتنەوەی دلّی دۆستەکەت باشترە لە

درووژاندنی بابەتێکی ناکۆك، کە دیار نیە راستی و پێکان بەلای کامتانەوە یە..

● خەندەی سەنگین و مانابەخش جوانەو، مایەی خۆشەویستبوونتە لەدڵی دۆستەکانت، وەلێ بیر تیژ بوون و درەوشانەوەی دڵ : لەخەمناکیی دەروونیی دایە، خەمناکیەك کە قووڵیی بیرکردنەوە و رامان لەحەقیقەتە گەورەکان دروستیان کردووە .

● وای دانێ لەنێوان تۆو هاورێ گیانی بەگیانیەکەت فەرمانی لە سێدارەدان بۆ یەکێکتان دەرچووە، ئایا دەروونی خۆت پشکنیوە؟، حەزدەکەیت ئەوەی لەسێدارە دەدرێت ئەو بێت و، تۆ لە ژیانتدا بمێنیتەوە؟ بەڵام بزانە ئاستی دەروونیی بەرز ئەوەیە (بە حەز: نا) (بەکردار) هەوڵدەی پشکی مردن بۆخۆت هەڵبژێری و،لەپێناو زیندوو هێشتنەوەی ئەوی تردا بەیداخی قارەمانی و نەمریی هەڵبکەی.

● عەقڵ دەتوانێ جیاوازی نێوان شتەکان : ( چاکی و خراپی، دروستی و نادروستی، بەرزی و نزمی، دووری و نزیکی، رووناکی و تاریکی، جوانی و ناشیرینی) دیاری بکات، ئیرادەش دەتوانێ شتە هەڵبژاردراوەکانی عەقڵ مومارەسە بکا و، بە کردەوە بیاخاتە پانتایی

جێبەجێ بوونەوە، بەهەبوونی ئەم دوو خەسڵەتە : مرۆڤ سەروەری زۆربەی بوونەوەرانە و ڕێزلێگیراوترینیشیانە، وریابە عەقڵ لە دۆزینەوەی ڕێگا ڕاستەکان و هەڵبژاردنی بابەتە بەرهەمدارەکان بەکاربێنە، ئەوانەی بەرژەوەندی دونیا و دوارۆژی خۆت و تەواوی مرۆڤایەتیان تێدایە، تا ئیرادەت پابەندی ژیریی بێت وباخی ئارەزووت میوەی دڵنیایی و نەمریی بگرێت..

● **بۆ گۆڕان** : بزانە کە لە دڵ و دەروونەوە دەست پێ دەکات، تا لەناخەوە پەیکەری سەرجەم شتە ناشایستە و نالەبارەکان تێکنەشکێنی لەدەرەوە بەسەر یەکدا ڕماندنی هۆکارەکان هیچ سوودێکی نییە، ئەوەی لەناخەوە ڕەگ وڕیشەی گۆڕان دادەکوتێ : ترسی لەئاییندەی خۆی نییە، کەچی ئەوەی بەتەنیا پەیکەرە دەرەکیەکان لار دەکاتەوە : لە ئەمڕۆشیدا لەرزۆکە، بۆ ناسینی خۆت : ( ناسینی ڕاستەقینە )، بۆگۆڕینی خۆت : (گۆڕینی بنەرەتیی )، بۆ ناسین وگۆڕینی جەوهەرو حەقیقەتی خۆت : دەبێ تەواوی ئەو پەیکەرە دەرەکیانە تێکبشکێنی کە کۆمەڵگە بە پێی نەریت و پێویستیی خۆی بۆی تاشیوی .

● هەر کاتێك، لە هەر بابەت و باس وگوفتار و ڕەفتار و بیروبۆچوونێکت وەرچەرخایت و گۆڕانت بەسەرداهات : پەلە مەکە لەبڵاوکرنەوەی ئەم هەواڵەت بەناو دۆستەکانتدا، بانگەشە و داوای ئەو گۆڕانە لەدەورووپشتت مەکە بەم خێراییە ، لێگەڕێ ئەو گۆڕانەت هەموو خانە و پێکهاتەکانی وجوودت ڕۆشنکاتەوە و ببێتە بەشێك لە بوونی خۆت و هەرگیز نەکرێ لێك جوودابینەوە ، بابێتە ئەندامێکی دانەبڕاو لەدڵ ودەروونتا و، هەموو خەیاڵ و هەست ونەستت داگیر بکات، لێگەڕێ با زەمەنێك هێمنی و بێ دەنگیت قسە بکات بۆ دەوروبەرت، لێگەڕێ با عەیامێك کردارت چەشنی مەشخەڵێکی درەخشان ڕۆشنایی پەرشکا بۆ هاوڕێکانت، ئەمەش بە دڵنیاییەوە بە تێپەڕاندنی زەمەن ولەگەڵ ژیان وتێگەیین وپێگەیینی ڕاستەقینە بەرهەم دێ ...

● بزانە کەس ناتوانێ بتگۆڕێت ئەگەر لەناخی خۆتدا بڕیاری گۆڕان نەدەیت، بڕیار بەرهەمی نابێ ئەگەر نەیکەیتە کردەوە، کردەوە بەتێکۆشان، تێکۆشانی بەردەوام، پاشان کۆڵنەدان و ئارامگرتن لەسەر تەنگ و چەڵەمە و نەهامەتیەکانی ڕێگا، پاشان دامەزران و

خۆڕاگریی، بەمە چرای ئومێدت هەڵدەبێ و ژووری ژینی دونیا و داڕۆژت ڕووناك دەبێتەوە.

● بە پاڵنەری سۆز وعاتیفە، بێ لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوە بەرگری لە هاوڕێکەت مەکە کە تووشی کێشەیەك بووە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا، هەقت خۆشتر بووێ لە هاوڕێکەت، دوای ئەوەی گەیشتی بە ئەنجامی دروست، ئەنجا پەیامدارانە سەری بخە، بەوەی ئەگەر هەق بەلای ئەودا کەوتبوو پشتگیری لێ بکە بە بەڵگەو شاهێدی و زیاتریش، ئەگەر هەق بەلای بەرامبەرەکەشدا بوو ئەوا دەستی دۆستەکەت بگرە و مەهێلە لەوە زیاتر سوور بێ لەسەر ناڕەوایی کردن، کە ئەمەشیان هەر پشتگیری لێکردن وسەرخستنیەتی بە جۆرێکی دیکە ...

● لەخۆڕاگری و ئەشڵەژان و دامەزراویت لە تەنیاییدا: بتوانە بێ هەموو کەس بژی، بەڵام دۆستێکی پەیامداری راستەقینە، هاوڕێیەکی وەفادار و نهێنی پارێزی خۆت ، بە هیچ شتێ مەگۆڕەوە و ئاسان مەهێڵە لە دەستت دەرچێ، با لەو پێناوەشدا سەرو سامان و کەسایەتیت بکەوێتە مەترسییەوە !..

● چاوەڕوانی گۆڕان لەهەموو کەسیّ بکە، بە هەردوو باری چاکی وخراپیدا، ئەم پەیامە خزم وکەس و دایك و باوك و خوشك و برا و تەنانەت ئەو دۆستە گیانی بە گیانییەشت دەگرێتەوە کە ئامادەی هەموو قوربانیەکی لەپێناویدا و، تەواوی خەزنەی دەروونیشت خستوّتە بەر دەست ودیدەی، بۆیە باشتر وایە تەواوی نهێنیەکانت، سەرجەمی رازو نیازەکانت نەخەیتە بەردەستی کەس، بۆ ئەوەی لەکات و ساتی گۆڕان بەسەراهاتنی ئەم خزم وکەسە، ئەم دایك و باوك و، خوشك و برایە، تەنانەت ئەم دۆستە گیانی بەگیانیەشت: تووشی دەهشەتی دەروونی و راچەنینی دلّ و هۆش وهەستەوەرەکان نەبیت ..

● ئەگەر لارو لەوێریت بە چەند بارەیی و بەبەردەوامی لە ئازیزێکت دەبینی، ئەگەر گلەییت لە هەست وهۆش و بیر و گوفتار و رەفتاری دۆستێکت هەبوو، ناوی مەزڕێنە لەلای خەلّکی و دەنگ وباسی ناشایستەی بەناو دۆستەکانیدا بلاّوە پیّ مەکە، نا: ئەمە شێوازێکی تەندروست نیە بۆ راستکردنەوەو گۆڕاندنی ئەو دۆستەت لەباری نالەباریەوە بۆ باری رێك و راستی . سەرەتا لەوەوە دەست پیّ بکە: لەقوولاّیی دلّ ودەروونتەوە دوعای بۆ بکەی وئومێدی خەیر بخوازی لەم نەهامەتیە دەربازی بێت و ببێتە مرۆڤێکی تەندروست، ئەم دوعا و

ئومێد خواستنەشت هەر تەنها قسەی سەر زارەکیت نەبێت، بالێت ببێتە مەلەکە و هەموو هەست و نەست و خەون و خەیالّ و هۆش و بیرت داگیر بکات، پاشان کاتێکی زۆر گونجاو و شوێنێکی زۆر باش هەڵبژێرە، پاشان بە ئەوپەڕی دڵسۆزی و بەئەوپەڕی حیکمەت و بەسینەیەکی ساف و دڵێکی نەرم ونیان و بەزمانیّ: کە پڕ بیّ لە وشەو دەستەواژەی ناسك و شیرین و هەست بزوێن، بچۆرە لای و لەدوای ستایشکردنێکی زۆری و لەدوای سازاندنی زەمینەیەکی لەبار و دلّرفێن بۆ ئاخافتن : ئامۆژگاری و رێنومایی بکە و سەرەنجامی ناتەندروستی کارەکانی بخەرە پێش چاو، بەردەوام بە لە نموونە هێنانەوە و بەسەرهاتی مرۆڤە مەزنەکان و، با ئەم گفتوگۆو ئاخافتنەشت بە رووخسارێکی گەشی خەندە ئامێزەوە بێت کە پڕ بێت لەمانا و پەیامی دڵسۆزیت بۆ هاورێکەت ، دەشیّ ئەم هەڵوێستەت ببێتە سەرەتایەکی درەخشان بۆ وەرچەرخاندنی ئەم دۆستەت . ئەگەر خۆشت ئەم کارەت پیّ نەکرا، هەوڵدە ئازیزترین کەسیّ لە دڵی ئەم دۆستەت بدۆزیەوە و پەیامەکانت بەو بسپێرە و با ئەو لەجیاتی تۆ بەکارەکان هەڵسیّ، چون ئازیزان ئاسانتر دەکەونە ژێر کاریگەری یەکتری یەوە ..

● بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت هیچ ڕێگایەکی ناتەندروست مەگرە بەر، هیچ هەنگاوێك لە خەون و خۆزگە و خەیاڵ و ئومێدێکت نزیك مەبەوە، ئەگەر بە دوورخستنەوەی هەنگاوی کەسێکی تر لە هیوار ئاواتەکانی تەواو دەبوو،، تێکنەدانی یاسا دروستە مرۆڤێتیەکان : ئەو یاسا سەنگینانەی پارێزگاری لە پەیوەندییە پتەوە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن بە گرنگ بزانە و مافە ڕەواکانی خەڵکانی تر بە کەمتر مەزانە لە ئامانجەکانی خۆت ...

● هەمیشە ئامانجێك هەیە لە دڵی مرۆڤدا، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە چەندین هۆکار و ڕێگاو وێستگە هەیە، ئامانجی گەورە و ڕاستەقینە لە ژیانتدا دیاری بکەو پاشان جودای بکەوە لەگەڵ هۆکار و وێستگەکان . گرنگ گەیشتن بە ئامانج و بەرهەمەکانیەتی بەرێگاو شێوازی دروست .. هەرگیز خودی ئامانجە گەورەکە بەقوربانی هۆکار و وێستگەکان مەکە، ئەگەر لەپێناوی گەیشتن و بەردەست کەوتنی ئامانجە ڕاستەقینەکە کۆمەڵێك ماف وپێداویستیش لەدەست دا قەیدی ناکا، با هیچ شتێك لە خودی ئامانجە گەورەکە داتنەبڕێنێت، ئامادەی دەست هەڵگرتن بە لە تەواوی پلە و پایە و پەیوەندی و پێداویستیەکانی ژیانت، بەڵام بای تاڵە موویەك لەئامانج و بەرهەمەکانی خۆش مەبە.

● هەرگیز ڕێگا بەخۆت مەدە زیاتر لەوەی (هەی)ت دەرکەوی، هەرگیز ڕێگا بە(ئەوانی) تر مەدە بەشداری لە دروستکردن و باڵاکردنی کەسایەتی ناڕاستەقینەت بکەن، هەمیشە رەفتار وگوفتاری نەتەبا بە ناخ و ڕەوانی خۆت : هۆکارگەلی لەدایك بوونی ئەم کەسایەتیە نەخۆشەن لە دەروونتدا، ئەگەر پەیکەری عاریفێکی ریاکار، ئەگەر ئوستاد و حیکمەت خوانێکی دڵ تاریك، ئەگەر سەرکردەیەکی نادڵسۆزت لەناختدا بینی ئەوا زووتر لە خەڵك چەکووشی ئازادی وئازایی، تەوری هیممەت وهەقرەوی بگرە مشت و بە تەواوی هێزی دڵ وگیانت وردوخاشی بکە، با ڕووخساری رۆشن و راستەقینەت، با سیمای تەبا بە دەر و دەروونت (وەك هەیە) دەرکەویّ، با تەڵە و داوی خەیاڵ، با فێڵ و فریوی نەفس وشەیتان و ئارەزوو هەپروون بە هەپروون بێت ...

● کات وزەمەنی ژیانی خۆت دابەش بکە بەسەر دووکات و زەمەنی سەرەکیەوە:

یەکەم: زەمەنی (فەردی – زاتی – مەعنەوی – تەنیایی)

دووەم: زەمەنی(کۆمەڵایەتی– بابەتی – ماددی – زەمەنی ئەوانی دی)

تۆ هەمیشە لەزەمەنی فەردی و تەنیایی و مەعنەوی خۆتا خەریکی

بیرکردنەوەی قووڵ و پاکژکردنەوەی دڵ و سینە و رۆشنکردنەوەی دەروونی خۆت و بەهێزکردنی ئیرادە و دەوڵەمەندکردنی هۆش و بیر و دەروونت بە، خۆت بەتاڵکە لە هەرچی (ناوو بابەت ورووداو) هەیە و ،خەریکی پەیوەندی بەستانی پتەو و راستەقینە بە لەگەڵ خودا و حەزرەت گیان و، ژیان و مەخلوقات وگەردوون بەگشتی .. لەزەمەنی کۆمەڵایەتی و ئەوانی دیکەشدا کە لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کۆبوونەوە و پێکەوەبوون و گفتوگۆ لەنێوان تۆ و کەسێك یان کۆمەڵە کەسێکی تردا روودەدات : خەریکی ناسین و بەجێ گەیاندنی ئەرك و فەرمانی دروستی مرۆڤیەتی خۆت و پەرش وبڵاوکردنەوەی هەست و سۆز و میهرەبانی و پێدان و وەرگرتنی (سوودمەندیی)بە لەنێوان خۆت و ئەوانی دیکەدا، خەریکی بەسەرکردنەوە و لێپرسین و بەتەنگەوە هاتن و دابین کردنی پێداویستیە دروستەکانی ئەوانی دیکە بە بەپێی تواناو بۆ رەخسان، خەریکی تێگەیاندن و پێگەیاندنی عەقڵ و دڵ و دەروون وکەسایەتی پتەو و راستەقینەی ئەوانی تر بە، خەریك بە چەشنی چرا دابگیرسێ و بتوێیەوە بۆ رۆشنکردنەوەی سینەو و ژووری ژیانی هەمووان.

● بۆ ئەوەی پەیوەندی گەرم وگەشت بەسەلامەتی و نەپچڕاوی لەگەڵ ئەو دۆستەت بهێڵیتەوە کە خاوەن بیر و بۆچوونی تایبەت بە خۆیەتی دەربارەی مرۆڤ و ژیان وگەردوون، ئەوا پێویستە خاوەنی یەکێك لەم پێناس و هەڵوێستانە بیت و پەیڕەویشیان بکەیت لەژیانتدا:

1- یان دەبێ لە ئەوپەڕی دەوڵەمەندی و هێز وتوانستی رۆشنبیریدا بیت و لە باڵی (مەعریفە) دا بە بەڵگە و سەلماندنی گومانبڕ : عەقل و بەرنامە و تێڕوانینی دۆستەکەت بخەیتە ژێر پرسیارەوە و لە هزری خۆیدا بیگەیەنیتە ئەو ئەنجامەی کە هەرچی ئەتۆ وتووتە نمرەی راستیەتی لە هی خۆی زیاترە، پاشان لەباڵی (عیرفان) یشدا: توانای رازیکردنی دڵ و دەروونیت هەبێت بۆ ئەوەی دان بە راستیەکان بنێت و بڕیاری گۆڕانی بنەڕەتی و ڕیشەیی بدات لەناخی خۆیدا، چون ئەوەی زەمینە بۆ گۆڕانکاری دەسازێنێ: دڵ و دەروونە، پاشان هزرو عەقڵ ...

2- یان دەبێ باوەڕ بێنی بەوەی کە مرۆڤ بە هەبوونی جیاوازیەکانەوە جوانە و ڕێ بدەین هەرکەس خاوەنی بۆچوونی تایبەت بەخۆی بێت و، دەسکاری شتە ناوەکیەکانی یەکتر نەکەین، لە پشتەوەی ئەوانەوە کە

گۆڕەپانی ژیان وگوزەرانە : حەز بە بەختەوەری و سەرکەوتنی یەکتر بکەین، لە گفتوگۆشا تەنها لەسەر شتە کۆك و تەباکان بکەوینە قسە و باسەوە، بۆ ئەوەی لەجیاتی جیاوازی و یەکتر سڕینەوە : جوانکاری بۆ بیروبۆچوونەکانی یەکتر بکەین ...

3- یان دەبێ خاوەن رۆح و دڵ ودەروونێکی رۆشن و بەرز و بالاو فراوانی وەها بیت، بەرخاتری هێشتنەوەی پەیوەندی پیرۆز وبەتینی هاورێیەتی، دەست لەسڕینەوە و رەتکردنەوەی بیروبۆچوونی هاورێکەت هەڵگریت و لەبەرامبەریشدا (ئەو) : هەرچی هەوڵ وکۆششێك دەکات و دەدات بۆ داگیرکردنی هزری تۆ رێگیری لێ نەکەیت و، بێ دەنگی بەرامبەر بنوێنی و، دەروونیشی وەها حاڵیی بکەیت کە تۆ هیچ کێشەیەکی هزری و دەروونیت لەگەڵ خۆی و بیر و بۆچوونە تەندروستەکانیا نیە، بەمە هەم پەیوەندی دۆستایەتی گەرم وگەش دەمێنێتەوە، هەمیش لە کۆبوونەوەکانتانا هێمنی و لێك حاڵی بوون باڵ دەکێشێ بەسەر گفتوگۆکانتانا.

● هاورێکەت لە (کل – گشت)ی دا بناسە، هەڵوێستیك، یان کردارێکی مەکە پێوەر بۆ بڕیاردانت بە رەهایی لەسەری، مرۆڤ بەگەوهەر و حەقیقەتی ناوەوەی دەناسرێتەوە نەك رواڵەت وکرداری،

ئەوەی بەراستەقینەیی مرۆڤ بەدەروەی خۆی ئاشنا دەکات: ئەو رۆح و هێزە بزوێنەرەیە کە رەگ وریشاڵی بەناو تەواوی بەش و پارچەکانی مرۆڤدا چەقاندووە ...

● هەمیشە ئومێد بڕوێنە لەدڵی هاورێکانت، بەردەوام ئەوەیان بۆ بسەلمێنە کە ئەوان خاوەن ئیرادەی بەهێزن وپایەکانی کەسایەتیان پتەوە و دەتوانن گۆڕان لەخۆیان و دەوروبەریشیان دروست بکەن، تۆ هەمیشە ئەو کەسە بە کە دۆستەکانت بۆ رەواندنەوەی خەم و ناسۆر و گومانەکانیان، بۆ زیندوو کردنەوەی هیممەت و ئیرادەیان، بۆ گەشەو نەش و نمای ئەقڵ و، جۆش و خرۆشی دڵ و دەروونیان سەردانت بکەن ...

● ئەگەر گەرمی یان ( تا ) ت هەبوو: مەترسە لە دابەزینی نمرەی کەسایەتیت و شەرمیش لە سەیر لیٚ کردنی خەڵکی مەکە لەخۆت، بەدیار چاوی هەموویانەوە ( ئاو ) بکە بە سەر و سیما و دەم و چاو و دەست و قاچت، با گەرمی و ( تا ) کەت بڕوات و بڕەوێتەوە، گرنگ دەربازبوونی تۆیە، چون ئەو ئازار و ئێش وژانەی هەیە لە ( تۆ ) یە نەك ( ئەوانی دی ) ، ئەمە نموونەیە و( تنزیل = دایبەزێنە ) سەر هەموو پارچە و پەیوەندیەکانی ژیانت و، با هەموو بەش و بابەتە گرنگەکانی بوونت بگرێتەوە، بەمە لە پەرستنی نادروستی (ئەوی تر)

خوّت رزگار دەکەیت و لەسەر لووتکە بەرزەکانی دەروونیشت ئالآی راستی و ئازادی (دلّ و ژیریی ) ت، هەلّدەکەی ...

● بوّ پاداشت ئەگەر خاوەنی چاکەکەشت دەست نەکەوت، نزیکان و دوّستانی (خاوەن چاکەکە) بەهرەمەند کە لەو خەلاّتانەی کەبەنیازی بیانبەخشیت، بەلاّم بوّ سزا : ئاممان هەرگیز نەکەی جگە لەخودی تاونبارەکە خوّی کەسی تر سزا بدەی، دایك و باوك و خوشك و برا و کەس و کار، کەسیان دەستیان لە تاوانەکەی ئەو نیە، هیچ بیانوویەکیش بوّ سزادان و ئازاردانیان لە ئارادا نیە، توّ با یەکەم تیّکشکیّنەری ئەم داب ونەریتە ناتەندروستەی کوّمەلّگا بیت و بەم هەلّویّستەشت بچیتە ریزی مەردو جوامیّرانەوە ...

● دوای هەموو گوفتارو رەفتاریّکت گویّ لە دەروونی سەلامەتی خوّت بگرە و بزانە دەلّیّ چی؟ ...... بیّ گومان: ئەوەی گوتووتە و کردووتە ئەگەر باش بووبیّ: ئەوا ئارامییەکی بیّ پایان رووت تیّ دەکا و هەستیّکی هیّمنی خوّشنوود داتدەپوّشیّ، بە پیّچەوانەوە ئەگەر ئەوەی گوتووتە وکردووتە ناتەندروست بووبیّ: گڕی شلّەژان و نائارامی و دلّەراوکیّ لەدەروونتا کلّپە دەسیّنیّ، بەدەنگیّکی ویژدان هەژیّن لەسینەتدا ئاگادارت دەکاتەوە و پیّت دەلّیّ (چیت کرد؟ نەدەبوو وات

گوتبا و وات کردبا! ) ئەمە تاقی بکەرەوە و بەدڵنیاییەوە هەروایە، چونکە هەموو ناخێك زمانی خۆی هەیە و، هەموو دڵێك چاوی خۆی هەیە و، هەموو دەروونێکیش پارێزگارێکی هەیە و خاوەنەکەی لە هەر شتێکی دروست یان نادروست ئاگادار دەکاتەوە : ﴿ إِنْ كُلُّ نَفْسٍ لَمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ ( الطارق: 4)

● به ئاسان پەیمان مەدە، خۆ ئەگەر بەڵێن و پەیمانت بە هەر کەسێك دا بێ گومان و بەدڵنیاییەوە ( لە کات و شوێن و بەمەرجی خۆی ) بەجێی بگەینە و گوێ بە گەورەیی و بچووکی کارەکە مەدە، گرنگ ئەوەیە تۆ خاوەنی گوفتار و ڕەفتاری خۆت بی، یەکێك لە خاڵە بنەڕەتیەکانی پێکهاتی کەسایەتیەکی پتەو لەمرۆڤدا بەجێ گەیاندنی پەیمان و بەڵێنەکانیەتی ...

● دیاری بچووکی دۆستەکەت بەگەورە سەیرکە و تەماشای چەندێتی و چۆنیەتی خەڵاتەکە مەکە، ( تۆ ) لەبیر بوونەکەیت لەلا بەهادار و بەنرخ بێت ..

● ئەگەر لەغیابی ( ئەو )، لە پاشەملە : شتێکی نادروست و ناشایستەت لەبەرامبەر کەسێك گوتبوو ویژدانت ئازاری دەدایت : ئەوا یەکەم بینینی ئەو کەسە بەهەل بزانە و داوای لێبوردن وگەردەن ئازایی لیٚ بکە، بە هیچ جۆرێك گویٚ بەپایەی کۆمەڵایەتیت و نمرەی کەسایەتیت مەدە، ملکەچی و بچووکی لەبەرامبەردا بنوێنە وەك وەستانی سەربازێکی سەرپێچیکار لەبەردەم فەرماندە و سوپاسالارێکی دادگەری بە هەیبەت دا..

● وەختیٚ هاورێکەت قسەت بۆ دەکات، تەماشای رەنگ و ڕووخساری بکەو هەموو هەست وهۆشی خۆتی لەخزمەت دانیٚ، رووت لێی وەرمەگێڕە و خۆت بەهیچ شتێك خەریك مەکە و، بەهیچ شێوەیەك تەریقی مەکەوە، ئەو شتەی کە بۆت باس دەکات ئەگەر تەواوی بابەت و بەسەرهاتەکەشت لەلابوو قسەی پیٚ مەبڕە و وای نیشان مەدە کە پێشتر ئەو باسەت زانیوە، بەم ئاکار و هەڵوێستە بەرزەت ( ئەو ) : هەست بە بوون و نرخ و بەهای زێتری خۆی دەکات و ( تۆ )ش : تای تەرازووی کەسایەتیت سەنگینتر دەبیٚ ...

● لە گفتوگۆتدا لەگەڵ هاوڕێکەت تەواوی ئەو شتانەی دەیانزانی لە دانیشتنێك و لەماوەیەکی کورتدا مەیانخە ڕوو، چونکە هەرچەند خۆپارێزیش بیت هەر ئەوەیان لێ دەخوێندرێتەوە کە نیازی (خۆ بە زۆرزان ) نیشان دانییت هەیە، با تەمەن ویەکتر ناسین و بەیەکەوە ژیان وسەفەرو مامەڵەو دراوسێیەتی : راستتر و رۆشنتر بەیەکتان بناسێنێ ..

● بە زۆر پێکەوە ژیان گرێ کوێرەکلنی زمان لەنێوان تو و هاوڕێکەت دا دەکرێنەوە، بە تێپەڕینی کات هێماکانی فەرهەنگی گفتوگۆ شی دەبنەوە، بەمە ئاسانتر و زووتر درەختی لێك حاڵی بوونی نێوان تو و هاوڕێکەت بەروبووم دەگرێ . ئەمە بکە پێوانە و لەگەڵ هەر کەسێك دووای بەمەرجی مەگرە ( بەئاسان و زوو لەهەموو مەرام و مەبەستەکانت تێبگات )، چونکە مەرجی لێك حاڵی بوونی ئاسان و زوو ئاستی بەرزی رۆشنبیری و لەگەڵژیانی درێژ خایەن و ئاکاری باڵا و دەروونی گەشی کەسەکانە ...

● زۆر بیر بکەوە و کەم بدوێ، مەدوێ تا پرسیارت لێ نەکەن، ئەگەر پرسیارت ئاراستە کرا بەپێی زانیاریەکانی خۆت بەڕاستی وەڵام بدەوە، هەوڵدە شێواز و ئاوازی دەنگت بە چەشنێ نەرم و نیان بێت سەرنجی

دۆستەکانت رابکێشیت بەڵام بیٚ لاسایی کردنەوە و زۆر لەخۆ کردن، هەتا دەتوانی با وشەکانی فەرهەنگی زمانت ناسك و شیرین و دڵخۆشکەر و ئومێد بەخش بن و پاکیان بکەوە لە وشەگەلی ناخۆش و ناسازگار و دڵشکێنەر ...

● ئەگەر نیگەرانی و لێك تورەبوون کەوتە نێوان تۆو هاورێکەت، هەمیشە تۆ ئەو کەسە بە کە دەستی ئاشتبوونەوە درێژ دەکات، درێژ دادرِ مەبە لە چبور چبوری کێشەکان، پاساو و پاکانەی هاورێکەت قبووڵ بکەو لە وردو درشتی ناتەباییەکان مەکۆڵەوە، پەتی پەیوەندی ئەگەر داوە دەزوویەکیش بوو بە زۆری بزانە و مەیپچرێنە، هەمیشە سینە پاك و ئاسان رەو و خۆش خولق و نەرم ونیان بە .. خۆ ئەگەر ( تۆ ) نێوان گیریت کرد لەنێوان دووکەس یان دوو کۆمەڵەی لەیەکتر توورەبوودا : ئەوا گویٚ لە هەردوو بەرەی ناکۆك بگرە و دوای ئەوپەرِی شارەزاییت لە دەستووری ( چارەسەری کێشەکان ) با کاتیٚ : برِیاری یەکلایی بوونەوە دەدەیت: نەبرسی بیت و نە تینوو، نە خەم و خەو داگیری کردبیت و نە توورەیی و نەگومان و نە رارِایی، دوای ئەوەش کە ئەنجام گیری دەکەیت و مافی راستەقینە بۆ خاوەنەکەی دەگێرِیتەوە،

فایلی ئەم بابەتە لەدڵ وهزرو زمانتدا داخەو نهێنیەکانیان بپارێزە و هەرگیز لای هیچ کەس باسیان مەکە ...

● هەر چاکەیەکت لەگەڵ کرا لەلایەن هەرکەسێکەوە، تەواو منەتت پێی بیْ و بە قەرزی بزانە لەسەرخۆت، زوو یان درەنگ پاداشتی ئەم چاکەیە بدەرەوە خاوەنەکەی بەچاکەیەکی باشتر و زیاتر لەخۆی، زوو زوو باسی ئەم چاکەیە بکە لەسەر خۆت و واش بکە دەنگ و باسەکەی بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە، بەم هەڵوێست و پەیامەت هەم خاوەنی چاکەکە هاندەدەیت بەرەو چاکە خوازی، هەم خۆشت پەتای بیْ وەفایی ناتگرێتەوە، ئەگەر دەستت نەگەیشتە خاوەنەکەی، تا چاکەکەی بەباشتر لەخۆی لەگەڵدا بکەیتەوە، ئەوا چاکە لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و برا وخزم وکەس وکاری ئەو کەسە بکە، ئەمە لوتکەی رەوشت جوانی و ئاکار بەرزییە لە بوونی هەر مرۆڤێکدا ..

● ناوی هەموو ئەوانەی قەرزیان پێداوی لەلای خۆت یان لەدەفتەری یادەوریت تۆماربکە و هەرگیز لەبیریان مەکە، بزانە رۆژگارێك ئەمانە دەسگیرۆییان کردووی، خۆ ئەگەر رۆژگار وەرچەرخاو قەرزی تۆ بەزیاتر لەئەوان و بەمۆڵەتی درێژتر لەهی ئەوان کەوتە لای یەکێکیان، ئەوا: تا کاتی دیاری کراوی خۆی نەیەت داوای مەکەوە و لای کەسیش باسی

مەکە، خۆ ئەگەر لەدەستی نەبوو و نەیتوانی لەوادەی دیاریکراوی خۆی پێت بداتەوە، ئەوا هەرگیز تەنگەتاوی مەکە و مۆڵەتی زیاتری پێ بدە، کەس رامەسپێرە بۆ داوا کردنەوەی و ئەگەر توانیت بەو شوێنانەش گوزەر مەکە کە رێگە و جێگەی یەکتر بیننتانە .

● ( یەك ) چاکە بەرامبەر ( دە ) خراپەی هاورێکەت وەکو یەك هەژمار بکە، لەوەش زیاتر: با هەمیشە لە دڵ و دیدەی تۆدا پەردەی ئەستووری ئەم ( یەك ) دانە چاکەیە سەراپا جەستە و لاشەی تاریکی ئەم ( دە ) خراپەیە داپۆشێ، بەمە تاجی زێوینی ( وەفا ) دەخەیتە سەرت و هەر رۆژ خەریکی هاورێ گرتن نابیت و ئەم پەیامەشت بۆ هەموو شوێن وکاتێك دەگونجێت و بۆ تەواوی مرۆڤایەتیش سوودمەندە، چونکە ئەم چەشنە دڵ و دەروونە چرای رۆحێکی گەش وگەرم وئارام تێیدا هەڵکراوە ...

● روتویانە :لەهۆشمەندی وتێڕامان وگفتوگۆدا مرۆڤەکان سێ چەشنن:

یەکەم/ هەیانە هەمیشە دڵ ودیدەو هۆش وبیری لەسەر (ناو و کەسەکان )ە، تەواوی ( شت و رووداوو بنەما بنەڕەتیەکان )

دادەبەزێنێتە سەر کەسایەتیەکان و دروستی ونادروستی هەموو شتەکان لەرەفتارو گوفتار و هەڵوێستی ئەوان بۆ یەکلادەبێتەوە، ئەمانە: (خاوەن ئەقڵە بچووکەکانن)..

دووەم/ هەیانە ( شتەکان و رووداوەکان ) دەکاتە دەستمایەی بیرکردنەوەو تێڕامانی، بە هاتنە پێش و دواهاتنی رووداوەکان : کەسایەتیەکان پێناسە دەکات و بنەما گەش و گەورەکان باوەڕ پێ دێنێ، ئەم چەشنەشیان خاوەنی (ئەقڵە مامناوەندەکان)ن ..

سێ یەم/ هەشیانە تەواوی سەروکار و قووڵبوونەوە و ئاوێتە بوونی ( لەگەڵ بنەما بنەڕەتیەکان و بەها باڵاکان) ە و تەواوی ( مرۆڤ و رووداوەکان ) بە تەرازووی (پەیام وبنەما گەورەکان) دەپێوێ و راستی و ناڕاستی هەموو ( رووداوو کاراکتەرەکان ) دەباتەوە ناو ناخی دەستوورەکان، گفتوگۆی تەواو و بەردەوامی لەسەر ( بنەما سەرەکیەکانی ) ژیان و مرۆڤە و هەرگیز دانابەزێتە سەر شتە ناشایستە و بچووکەکان، لایەنگیری کەس نیە هەق نەبێت و ، دەمارگیریی بۆ هیچ ( شت ورووداو و کەس و گرۆهێك ) نیە رێسای تەندروست نەبێت.. لەهەرکوێ هەق دەرکەوێ پەیڕەوی لێ دەکات و ناپرسێ ئەوەی هەقی لادەرکەوتووە کێ یە؟ چون ئەو ئیش و پێویستی

راستەقینەی بە خودی هەقەکەیە نەك خاوەنەکەی ،هەرگیز باکی بە لێهاتنە دەنگی داب و نەریتی ناتەندروستی کۆمەڵگاش نیە، ئەمانەشیان خاوەن ( ئەقڵە گەورە و گەشەکان ) ن، سەراپایان پڕە لە چاوەڕوانی بۆ دەرکەوتنی هەق و، بوونیان لێوڕێژە لە ئامادەیی بۆ پشتگیری لە دادگەریی، بۆیە ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵ دەکەی بەر لەهەر شتێك بزانە خاوەنی ( ئەقڵە بچووك یان مامناوەند یان گەورەو گەشەکە ) کامیانە؟ ئینجا بازنەی بیرکردنەوی دیاری بکە و، پاشان بە پێی ئاست و هۆشمەندی خۆی لەگەڵی بدوێ، چونکە سوودی نیە و نابێ ( ئەو ) لەبازنە و ئاستێك پرسیار لەتۆ بکا و ( تۆ ) ش لەبازنە و ئاستێکی بالاتر یان جوداتر وەلام وبەڵگەی بۆ بهێنیتەوە .

● شەیدابە تا ترۆپکی شەیدایی، شەیدای هەقیقەتی بالا، شەیدای ئاکاری بەرزی (حەزرەت گیان) : ڕابەری مەزن، شەیداییە تەکانی گەورە بە دەروون دەدات، شەیداییە ئەسپی تیژڕەوی دڵ وگیان بۆ گەیشتن بە ئامانجە درەخشانە مەعنەوییەکان ..

## پەیامی: بانگەوازکاری

کاك ئەحمەد بۆ کاری بانگەواز و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای راستەقینەی خودا لەلایەن کەسانێکەوە کە سەرقاڵی دەعوەت و ڕێنیشاندانی خەڵکانی خودان بەمەرجی گرتبوو کە دەبێ خاوەن دڵ ودەروونێکی یەکجار گەرم وگەش بن .. لەتەك ئەو زانیارییە تێروتەسەل و هەمەلایەنەی کە دەبێ بیانبێ نسبەت بە ڕۆحی مەطلەبی ئایین و گەوهەری پەیامەکانی خودا و حەزرەت گیان، لەهەمان کات دەبێ خاوەنی دەروونێکی هەمیشە پەیوەست بە یادی خودا و دڵێکی هەمیشە مەست بەخەیاڵی حەزرەت گیان بن ... ئەم پێی وابوو : گرنگ ئەوەیە کۆڵ نەدەین لەبەئاگا هێنانەوە و چارەسەرکردنی دەردەکانی مرۆڤ، ئەگەر باجەکەی بە مەرگی خۆشمان تەواو بێت . کۆڵ نەدەین و بێزار نەبین و دەسبەرنەدەین لە هەوڵەکانمان و نەگەینە بنبەست لەگۆڕانی ناخی مرۆڤەکان، چونکە پێناسەی تێکۆشەر و دڵسۆز و پەیامدۆستان ئەوەیە کە : گرنگ ئەوەیە مرۆڤەکان لە دۆخێکی

ناتەندروستەوە بگوازینەوە بۆ دۆخێکی تەندروستی ئاوها کە سبەی ئەو ( تاك ) ە تاکێکی هاوکارو یارمەتیدەر بێ بۆ رزگارکردن و بەختەوەر کردنی مرۆڤەکان لەدونیا و دوارۆژدا، ئەم گواستنەوە و گۆڕینی ناخ و دڵ و دەروونەش لەدۆخێکی ناتەندروستەوە بۆ بار و دۆخێکی تەندروستی گەش وگەرم و ڕاست و ڕەوان بەکەسانێك دەکرێت کە حوججەتی سەرتاپاگیر و شاهید و شەهید بن بەسەر خەڵکانەوە، بەو مانایەی تەواوی بیر و بینش و دڵ وگیان وهەست و نەست و خەون و خەیاڵ و گوفتار و ڕەفتار و سەراپای پێکهاتی بوونیان شاهێدی حەقانیەتی پەیامی خودا بدەن، شاهید و شەهید بەو مانایەی ( سمع و بصر و فؤاد ) یان لە پێگەیشتووترین ئاستی خۆیان لە ئەرك و فەرمان دانە و بینایی و چاوی دڵیان کراوەتەوە، چون شاهیدی بەرزی مەعنەوی بەکەسێ دەوترێ کە پەیامە ئیلاهیەکان بووبنە ئایەت لەلای، بەواتە شاهید کەسێکە ئایاتی خوا دەبینێ و لەهەمان کات ( هەستی گەورەیی و شکۆمەندی مرۆڤ بەگشتی و ئیماندار بە تایبەتی و رێبوارانی گیان و دڵ سووتاوی ئیلاهی و راستەشەقامی رێگای مەعنەوی ) داگیریان کردووە و دڵ وگیانی خۆیشی چەشنی باخچەیەکی مەلەکوتیی دێتە بەرچاو کە گوڵپەیامە ئیلاهیەکان

شکۆفەیان کردووە تیایدا، وەلیٚ شەهید لەوانەش بەرزتر ڕۆیشتووە و لەجیاتی ئایات تەنها خاوەنی ئایەتەکان دەبینیٚ و لەجیاتی خەلق تەنها خالیق دەبینیٚ و (بوونی مرۆڤ ) وەك خەلقندەیەك بۆ تەجەللای ( اسماء و أفعال ) ی خودا وجوودی نەماوە لە دلّ و گیانیدا و لەتەواوی بوونەوەر تەنها و تەنها خوا دەبینیٚ کە بەخشندەی ڕاستەقینەی جوولّە و ئەرك و فەرمان و هیٚز و توانای دروست کراوەکان بیٚ.. کاك ئەحمەد بۆ گەیشتن بەم پلە و پایە و بۆ بەخشینی ئەم چەشنە دلّ و دەروونە بەم جۆرە موناجاتی لەگەلّ خواگیانی خۆی دەکرد :

( ئەی خودا دلیٚ خەلّات کە بەخۆم وعەزیز گەلم

تیٚ بگات و، کولّ بدات و، لە مردوو بخا تەکان )

ئەو بۆ ئەوانەی کە دەیانەویٚ هەنگاوی بەرزو بالاّ بگرنە بەر و شویٚن پیٚی کەسانیٚ هەلّگرن کە بە چاکترین و سوودمەندترین مرۆڤ ناسراون لەلایەن خوداو خەلّکەوە : بەمەرجی گرتبوو کە دەبیٚ دوو ئاکار لەهەست و نەست و ناخ و دلّ وگیان و تەواوی وجوودیان شویٚن بکەنەوەو، بەجۆریٚکیش تیٚکەلّی بکەن بە پیٚکهاتی بوون و ژیانیان کە ئیتر نەکریٚ لیٚك جوداببنەوە نەبەترس ونەبەتەماع، یەکیٚکیان

کەمکردنەوەی زەحمەت بەردانی خەڵك بۆ دەستەبەربوونی پێداویستییە ماددی و مەعنەویەکانی خۆیان، کەبەرەنجی شان و دەست و دڵی خەڵکان بکەوێتە دەست، ئەوەی تریشیان خزمەتکردنی ( تا چەندی دەکریّ ) ی خەڵکانی خودا، بەشێوەیەك کە سوودی ماددی و مەعنەوی بە ژین و دینیان بگەیەنیّ، ئەم پەیامەشی لەم دوو رستە شیعرییە درکاندبوو:

( گیانە تێکۆشە لەتەك مەردما

زەحمەت کەمتر وخزمەت زۆرتر کەی

تەنیا بە فایـەی زۆرتر گەیاندن

بە پلەی بـــەرزی (خیر الناس) ئەگەی )

## پەیامی:

## ناسینی دوژمنی راستەقینەی مرۆڤ

ئێمە هەمیشە لە شکستاو لە تێکشکانی دەروون وکەسایەتیمانا رووبەڕووی هۆکارەکان و کەسەکانی دەرەوەی خۆمان دەبینەوە، بەهەموو هێز و توانایەکی ماددی و مەعنەویمان بەرگری لەبوون و بەرائەتی خۆمان دەکەین و پاساو بۆ داڕووخانە جەستەیی و ناخەکیەکانمان دەهێنینەوە و بەهەموو هێز و توانایەکی ماددی و مەعنەویش هێرش دەکەینە سەر دوژمنەکانی دەرەوەی خۆمان کە بە : ( هۆکارو کەسەکان ) ی دەزانین، کەچی موفتی زادە بە وردبینی چاوی دڵ و لە ژێر رۆشنایی پەیامی خودایی دا، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە (نەخێر) دوژمنی سەرسەخت و راستەقینەی ئێمە ( نەفس وشەیتان) ن و چاکتر وایە لەجیاتی هەر دوژمنێك هەرچی زووە رووبەڕووی ئەو دوو دوژمنە راستەقینەیەی خۆمان ببینەوە و، بۆ تامردنیش لەسەنگەری بەرگری دابین بۆی، ئەم پەیامەشی لەچەندین شوێن لە شیعرەکانی دا

درکاندووە، ئەمەشیان نمونەیەکە کە (نەفس) بە دوژمنێکی سەرسەختی مرۆڤ دەزانێت لەکاتێکا بەداخەوە زۆربەی مرۆڤە زیانمەندەکان لێی بیّ ئاگان، دەفەرمووێ :

( زلمت کە لیّ بچیّ لە نەگـــــرویسی زالمیّ

بۆ تولّە خـــۆ خوەراس وخەوت لیّ حەرام ئەبیّ

هیچ دوژمنیّ هەزار یەکی نەفست شەڕی نیە

چۆنە لە شوێنی ئەمری، دڵت بیّ سەقام ئەبیّ )

## پەیامی: داننان بە هەڵە

مرۆڤ وەك سروشتی خۆی تا پلە و پایەی دەروونی و کۆمەلایەتی بەرزتر بێتەوە سەختتر دەتوانێ لەبەرامبەر هەڵە و نەپێکانەکانی دان بە راستیەکان بنێت و بە بەرچاو و دڵ وگوێچکەی خەڵکانەوە بڵێ : من هەڵەم کرد و نەم پێکا، هەمیشە پاکانەی خاوەن پلە و پایە ئاینیەکان ئەوەیە کە ئەگەر دان بنێین بە هەڵەیەك کە گوتوومانە یان کردوومانە و داوای گەردەن ئازادی لە کۆمەڵگا بکەین : ئەوا دەبێتە پەڵەیەکی رەش بەسەر سیمای کەسایەتی ئاینیمان و لەمەولا گەر هەقیش بڵێین بە گومانەوە لێمان وەردەگرن . پاساوی لێپرسراوان و سەرپەرشتیارانی خەڵکانیش ئەوەیە کە ئەگەر دان بنێین بەو هەلانەی گوتومانە و کردوومانە ئەوا متمانەی لێهاتوویيمان لەبەرێوەبردنا لە دڵی خەڵکان لەدەست دەدەین و ئەو دەمەش بۆ هەر ئەرك و مافێك کە بۆیان دیاری دەکەین نارەزایی دەردەبڕن و سەرپێچی لێ دەکەن، دواتریش ناتوانین لەکات و ساتی پێویست بوونی رووبەرووبوونەوەی مەترسیگەلێك کە یەخانگیری خاك و خەڵك دەبێتەوە : هاورێ و هەماهەنگیان بکەین

بەهەست کردن بە لێپرساوێتی و ، تۆوی گیان فیداییش بچێنین لە هزر و دڵ وگیانیاندا! کەچی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بەپێچەوانەی هەموو ئەو بیرکردنەوە نەخۆش و ناتەندروستانە ( لەکاتێکا کە بالآیی هەموو پلە و پایە ئایینی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و سیاسیەکانیشی) هەبوو، بەتوندی بەرپەرچی ئەو خووە ناپەسەندەی دەروونی مرۆڤی دەدایەوە و بەنەخۆشییەکی کوشندەشی دەزانی بۆ مردنی دڵی مرۆڤ و، لەبارچوونی خاکیی بوون و، ئاست و قەوارە و قەبارەی مرۆڤییێتیمان.. ئەو ئاسان دەیتوانی دان بنیّ بە هەڵەکانیا و، لەوەش زیاتر پەرش و بلاّوشی بکاتەوە بەناو دۆستەکانیا، بەکوڵی دڵیش دەگریا بۆ ئەو زیانانەی کە لەئەنجامی ئەو هەڵەیەوە رووبەرووی دۆستانی بووەتەوە، بەدڵ داوای لیّ بوردن ولێخۆشبوونی لەخواو، پاشان لە دۆستانیشی دەکرد، هیچ شەرم وترسیشی لە نزمبوونەوەی نمرەی کەسایەتی خۆی نەبوو، بە پێچەوانەوە : بەم هەڵوێستە مەردانەی هەندەی تر بەرز و بالآ بوو، هەم لای خودا و هەم لەدڵی دیندارانی راستەقینەشدا، ئەو لەوەش قووڵتر دەیڕوانیە ئەم بابەتە و مەترسیەکانی : بۆیە لەنێوان خۆی و خوایا لەموناجاتی گەرم وگەشیا داوای لە خواگیانی خۆی کردبوو ئەگەر لەحاڵی ئەمەن و ژیانیشیا پەی نەبرد

بەسەرتاپای هەڵە و نەپێکان و کەموکورییەکانی ئەوا خواگیان رۆحی ئەو بباتە خەونی کەسانێکی دەروون سازگارەوە و لەخەودا هەڵەکان دەستنیشان بکات و پاشان دۆستانی لێ ئاگادار بکاتەوە، ئەوەش بۆ ئەوەی هەم لەدونیا کەس بەهۆی هیچ یەکێ لە گوفتار و رەفتارەکانی ئەو گرفتار نەبێ، هەم لە دوارۆژیشا شەرمەزاری لای خواگیان و حەزرەت گیانی خۆی نەبێت ...

## پەیامی: تەساموح

## لیٚبوردەیی وگەردەن ئازادی لەدڵدا

دەربارەی ئاشتی وتووڕەبوون گوتوویانە : مرۆڤەکان لەناخ وسروشتی خۆیانا چوار چەشنن :

- هەیانە زوو تووڕە دەبیٚ و زوو ئاشـــــــت دەبیٚتەوە .
- هەیانە درەنگ تووڕە دەبیٚ و درەنگ ئاشت دەبیٚتەوە .
- هەیانە زوو تووڕە دەبیٚ و درەنـــــگ ئاشت دەبیٚتەوە .
- هەشیانە : درەنگ تووڕە دەبیٚ و زوو ئاشت دەبیٚتەوە.

تۆ ئەگەر توانیت زۆر کەم تووڕە بە، ئەگەر تووڕەش بوویت بەناچاری: ئەوەیان بە کە درەنگ تووڕە دەبیٚ و زوو ئاشت دەبیٚتەوە، ئامان هەرگیز لەپیٚڕی ئەوانە نەبیت کە زوو تووڕە دەبن و درەنگیش ئاشت دەبنەوە، چونکە بیرکوڵ و دەروون تاریك ودڵڕەقن، بارانی رەحمەت و نەرم ونیانیی

کێڵگەی سینەیانی تەڕ نەکردووە، زەنگی حیکمەت لەخەوی توند و تیژی و ( هەرمن + بەتەنیا من ) بێداری نەکردوونەتەوە ..

هەتا دەتوانی دەوروبەر و هاوڕێکانت خۆشبویّ، خۆشەویستی تۆوێکی بە پیت و فەڕە : دانەوێڵەی ملکەچی و بەگویّ کردنت بۆ دەپشکوێنیّ لە دلّ و دەروونی دۆستەکانت، خۆ ئەگەر نەتتوانی خۆشەویستی ببەخشیەوە، ئامان نەکەی دڕك و داڵی رق وقین سینەی سافت هەنجن هەنجن کا، چون تەنها رق و قینە بەربەستی پۆلایینی گەیشتن بە لوتکەی بەرزی سینە سازگاری و پایەی بڵندی لێبوردەیی ... تەساموح ئەو چەمك وکردە قووڵە ئاینیەیە کە ئاسان ناتوانین لە بنج و بناوانی حاڵی ببین مەگەر لەکاتێکا کە موعایەشەی قووڵی حاڵ وکردەکە بکەین و ببینە جێبەجێکاری لیبووردنەکە خۆی، ئەوەش وەختیّ: بە ئاکام دەگات : کە زووتر پێناسەیەکی تێرو تەسەلی ( تەساموح = لێبوردەیی ) مان لەلابێت، تەساموح بریتیە لە ( پێشێل بوون و پاوان بوونی مافێك یان کۆمەڵە مافێکی ماددی یان مەعنەوی کەسێکی یان کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو بەدەستی ئەنقەست لەلایەن کەسێکی یان کۆمەڵە کەسێکی سنوور بەزێنی ماف پێشێلکارەوە، پاشان ئەو کەسە یان ئەو کۆمەڵە کەسە ماف خوراوە هەڵسن بە لێبووردەیی و

چاوپۆشی و دەست بەردان و دڵ بەردان لەتەواوی مافە ماددی و مەعنەویەکانیانەوە بەجۆرێك کە لێبووردنەکە لەقووڵایی ناخ و دڵ و دەروونیانەوە چەشنی کانیی هەڵقوڵێت و ئاوی سازگاری بەخشندەیی ببەخشێتەوە بەسەر ئەوانەی مافە ڕەواکانی ئەمانیان پێشێل کردووە، جا خودی ئەم لێبوردن و دەست بەردان و دڵ بەردانە لەمافەکان و گەردن ئازادی ماف پێشێلکارەکان، پێی دەگوترێ : تەسامیح ) . مرۆڤ بە سروشتی خۆی وایە حەز دەکات مافەکانی پارێزراو بن وکەس دەستی پێشێلکاریان بۆ درێژ نەکات، لەکاتێکیشا کە ئەو مافە داگیر کرا پێی خۆشە بەزووترین کات و بەهەر شێوازێك کە گونجاوە ئەو مافەی خۆی دەستەبەر بکاتەوە ... تا ئێرە مافی تەندروستی هەر پەیڕەوکارێکی پەیامگەلێکە کە ئەرك و مافەکانی سەرجەم مرۆڤەکانی دابین کردووەو سنوورە بەرینەکانی پاراستنی مافەکان و شێوازەکانی دەستخستنەوەی ئەو مافانەشی دەستنیشان کردووە لەحاڵ و ساتی داگیربوونیا، بەباوەڕ هێنان بەم پێناسەیەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەمە کردە و هەڵوێستێکە هەموو کەسێ ئاسان ناتوانێ پیادەی بکات لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، مەگەر کەسێك خاوەن بیرکردنەوەیەکی قووڵی ئینسانی و ئایینی بێت و بە پاڵنەرێکی ئیمانی بۆ دەستخستنی پاداشتی زیاتری

لای خودا و سازگارترکردنی دەروون و بەسەلامەت هێشتنەوەی دڵ و گیانی خۆی و خزمەتکردنی دین و ژینی خەڵکانی خوا ، وابکات ...

کاك ئەحمەدی موفتی زادە لە تێڕوانینیا وردو تەندروست بوو لە تێگەیشتنی بۆ چەمکەکان و ورد چووبوە بنج و بناوانی مەطلەبە ئیلاهیەکان، دەربارەی رق وکینە دەیفەرموو : دەشیْ لە دەروونمانا رقمان بێت لە خراپە و هەرچی شتێك کە مایەی سەرگەردانی مرۆڤە لە دونیا و دوراوژدا، وەڵیْ هەرگیز شوێن و دەرفەت نیە لە دەروونمانا حەز بەنەهامەتی و چارەڕەشبوونی خەڵکانی تر بکەین و پێمان خۆشبێت چی نەخۆشی و ناخۆشی و ریسواییە بێتە رێیان لە دونیا و دواروژدا، بەڕاستی ئەم خەسڵەتە دەروونی مرۆڤ وێران و چەپەڵ دەکات، چونکە ناکریْ تۆ رۆژگارێك بێتە پێشیْ و بتەویْ هەق و هیدایەت بگەیەنیە مرۆڤەکان و لە نێوانیشتانا دەریایەك هەبێت لە (کینە) ی یەکتر و حەز بە لەناوچوون و چارەڕەشیی یەکتر، موفتی زادە پێی وابوو نەك هەرنابیْ (کینە) ی خەڵکمان لەدڵ دابیْ، بەڵکو دەبیْ لە قووڵایی ناخ و دەروونیشمانا ئارەزوو بکەین هەرچی ( خراپەکار ) یشە بکەویتە سەر راستە شەقامی ئایین و بەهۆیەوە خۆشبەختی دونیا و دواڕۆژبیْ، دەیوت بە هەڵگرتنی (کینە) لەدڵماندا یەکەم زیانمەند خۆمان دەبین

کە دڵەکانمان وێران و چەپەڵ دەکەین و چرای ئارەزووی ( خۆشبەخت بوونی خەڵك لەدونیا و دوارۆژدا ) لەناخمانا دەکوژێنینەوە، دەبوت ئەگەر ئێمە لەبەر زات و نەفسی خۆمانە (کینە) مان گرتوتە دڵ ئەوا زیانەکەی بۆ دڵ و دەروون ئاشکرایە، خۆ ئەگەر لەبەر رەزامەندی خوداو سەرفرازی بەندەکانی خودایشە ئەوا چ لەوە خۆشتر هەیە لەدڵدا ئارەزوو بکەین هەرچی ئەوانەی هەن لەسەر رێگای تاوان و ئازاربەخشی و ماف خواردنی خەڵك: بکەونەوە سەرشەقامی هەق و هیدایەت و لە (پاشان) ئەوان خزمەت بە دین و ژینی بەندەکانی خوا بکەن؟ ئەو بۆ ئەو پەیامەی ورد چووبوە ناو حیلم و رەحمەتیەتی حەزرەت گیان و دەیویست لە پەیامی هەزار دۆستیی و حیلم و تەسامح و رەحمەتیەتدا (بە ئەندازەی خۆی) رۆحی تێکەڵ بە رۆحی حەزرەت گیان بکات و شوێن دڵ و شوێن پێی راستەقینەی ئەو هەڵگرێ، ئەو سەرسام بوو بەوەی کە لە( طائف ) دوای ئەو هەموو ئازار و دڵشکاندنەی کە پێی کرا (حەزرەت گیان) لەجیاتی ئەوەی دوعای ریسوا بوون و بەدبەختییان لێ بکات، دێت دوعایان بۆ دەکات کە خواگیان لەنەوەی ئەوان مرۆڤی چاك و پاك و ئیماندار دروست بکات و، لەنێوان خۆی و خوای خۆشیا موناجات دەکات و دەفەرمووێ :

ئەگەر ئەتوّم لیّ زویر نەبیّ من هیچ باکم بەم شتانە نییە، ئەو دلّمەست بوو بەوەی لەشەڕدا وەختیّ سەربازیّکی لەشکری ناموسلّمانان بە برینداری بەجیّ دەما لەجیاتی ئەوەی حەزرەت گیان فەرمان بە کوشتنی بدات، بەخوّی دەچووە سەر لاشەکەی و سەری دەخستە سەر ڕانی موبارەکی و بە دەستە زوّر پیروّزەکانی تەپ و توّز و خویّنی سەر دەمووچاوی سەربازەکەی لادەدا و بەر لەژینی خەمی دینی دەخوارد و چاوە موبارەکەکانی بەقورلّیی دەبڕییە چاوەکانی و بەهوّیەوە هەزاران ترووسکایی ڕەحمەت دەڕژایە ناو چاوەکانی و دلّ و گیان و هەست و نەست و تەواوی پیّکهاتی بوونیان درەخشان دەکرد و لەناخ و دلّیّك پڕ لە دلّسوّزی و بە زمانیّك پڕ لە سوکنایی پیّی دەوت بلّیّ ( لا إله الا الله ) تا شەفاعەتت بوّ بکەم لەدوا ڕوّژدا، ئەمەشی چەندین جار بەگویّی دا دەچرپاند و کوّلّی نەدەدا تا بە ئارەزووی خوّی شایەتومانی پیّ دەهیّنا، ئەو بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو سەربازە ناموسلّمانە بوّ شەڕ و کوشتاری موسلّمانان هاتووە، ڕەنگە دەست و شیریشی سوور بیّت بەخویّنی هاوەلّانی، بەلّکو ئەو هەمیشە ئەم پەیامە : ﴿وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين﴾ تیّکەلّ بەدلّ وگیان و هەست و نەست و تەواوی ذەڕڕاتی وجوودی ببوو، موفتی زادە سەراسیمە بوو بە

هەڵوێستی مەردانە و پێغەمبەرانەی حەزرەت گیان لەفەتحی مەککەیا، دوای ئەو هەموو دەربەدەری و دەردەسەری و ماڵ تاڵان کردن و کوشتن و برینەی کە بەخۆی و هاوەڵە بەرێزەکانی کردبوویان، وەختێ گوێبیست دەبێت یەکێ لەهاوەڵە زۆر بەڕێزەکانی ( لەبەر زۆر دڵسۆزی و خەمخۆری و خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ ) بەکافرەکانی ناو شاری گوتبوو بۆ کوێ دەڕۆن ( الیوم یوم الملحمة = ئەمڕۆ ڕۆژی کوشتار و تۆڵە سەندنەوەیە ) کەچی حەزرەت فەرمووی نەخێر ( الیوم یوم المرحمة = ئەمڕۆ ڕۆژی لێخۆشبوون و ڕەحمەت و گەردەن ئازادیە ).. یان وەختێ هاوەڵێکی بەڕێز و نزیکی پێی دەفەرموێت ئەی خۆشەویست: بۆچی ئەمڕۆ تۆڵەی ئەو هەموو نەهامەتیانەیان لێ ناکەیتەوە کە بەسەر خۆت و یارانتیان هێنا : لەوەڵامدا پێی دەفەرمووێ ( بعثت رحمة = بەڵام بزانە کە من بەڕەحمەت نێردراوم بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ).. هەموو ئەوانەی چەمکی تەسامو‌ح و لێبووردن و گەردەن ئازادی لەدڵـدا دەکەنە دەسمایەی ژیانیان و بریاردەدەن کە ئیتر نەرم و نیانی و لێبووردەیی دەستووری ژیانی ماددی و مەعنەوییان بێت: هەموو ژیانیان پڕدەبێ لە چەرمەسەری و تەنگ و چەڵەمە و کێشەو نەهامەتی و ڕووبەڕووبوونەوەی مەینەت و ئازار لەلایەن ئەوانی

ترەوە و، پاشان قبوولّکردنی هەموو ئەو ئازارانە و ( نەك هەرهیچ نەگوتن و رووبەڕوونەبوونەوە و ڕەت نەکردنەوە ) بەڵکو گوێنەدان بەو نەخۆشی و ناخۆشیانە و گەرم وگەشتر بوون لەسەر هاوڕێ کردن و هەماهەنگ کردنی خەڵکان بەم چەمکە پیرۆزەی ( لێبوردەیی )یەوە .... موفتی زادە دەیویست هەمووان فێری ئەوە بکات کە خۆیان رزگار بکەن لەکۆت وبەندی هەڵسوکەت و مامەڵەی ( مثل بالمثل ) واتە هەرکاتێك بەرامبەرەکەم هەواڵی پرسیم جا هەواڵی بپرسم، هاتە ماڵم جا بچمە ماڵی، بەدەنگمەوە هات و بەفریام کەوت جا منیش بەدەنگیەوە بچم و بە فریای کەوم، خوانەخواستە ئەگەر پێچەوانەی ئەوانەشی کرد منیش پێچەوانەی ئەوانەی لەگەڵدا بکەم بەخراپتر لەخۆیان، دەیوت هەمیشە لەهەڵسوکەوت و مامەڵە و دڵسۆزی و خەمخۆریتان بۆ رزگاری و خۆشبەختی خەڵکان چاوبڕنە ئەو دکتۆرە دڵسۆزەی کە عیلاجی منداڵێکی نەخۆش دەکات، ببینن چۆن ئەو دکتۆرە حەکیمە هەرگیز سووربوونەوە و هەڕەشەو جوێن و هەڵوێستی ناشایستەی ئەم منداڵە لەبەرامبەر خۆی وای لیْ ناکات سارد ببێتەوە و دەست هەڵگریْ لە پەیامەکەی خۆی کە چارەسەرکەر و رزگارکەری نەخۆشەکانە، چونکە ئەم دکتۆرە باش دەزانیْ لەبەر زۆری ئێش و ژانی

خۆیەتی ئەم مندالە قسەی ناخۆش و ناشایستە بە دکتۆرەکە دەڵیٚ نەك ئەوەی کە رقی لیٚی ببیٚتەوە:

( ئەگەر هەژاران لەبەر هەژاری

خڵەتیان تفیان لیٚت کرد مەیگرە دڵ

حەکیمیٚ دڵسۆز،منالیٚ نەخۆش

هەزار جنیٚو بـــــــا ناکەویٚتە سڵ )...

خۆ ئەگەر تەماشای ژیانی رۆژانەی خۆیشی( موفتی زادە ) بکەین دەبینین پرە لەنواندنی ئەم هەڵویٚستە مەردانەی ... وەختیٚ دەیانگوت: ( ئەحمەدی موفتی زادە ڕەنجی کوردی بە بادە ) دەیگوت گەر بچینە ناو ناخی ئەوان و تەماشای ئەو پیٚناسەیە بکەین کە بۆ منیان کردووە لە دەروونیانا ئـەوا ڕاست دەکـەن، بۆیە ناکریٚت تـۆ گـلەیی لەکەسیٚك بکەیت کە ( بە پیٚودانگی هۆش و بیری خۆی ) پیٚی وایە ڕووبەڕووی خائینیٚك بۆتەوە... لەراپەرینی خەڵکانی موسڵمانی ئیٚران، وەختیٚ کاك ئەحمەد لەزیندانا بوو، خەڵکانیٚکی ناسراو هەبوون (توقیع = واژوویان) کردبوو کە کاك ئەحمەد لەسیٚدارە بدریٚ، کاتیٚ خوا ئەم قەدەرەی نەهیٚنا

پێشێ و کاك ئەحمەد هاتەدەرەوە لەزیندان و راپەڕینی خەڵکانی موسڵمانی ئێران کرا، دۆستە دڵسۆزەکانی دەیانگوت ئێمە لەو کەسانە خۆش نابین و تۆڵەی ئەم هەڵوێستە ناشایستانەیان لێ دەکەینەوە، کەچی کاك ئەحمەد نەك هەرخۆی تۆڵەی نەکردەوە وکەسیشی رانەسپێرا بۆ تۆڵە سەندنەوە، بەڵکو دەیگوت ئەصڵەن هەر رازی نیم پێشیان بگوترێتەوە وگلەییشیان لێ بکەن، تەنانەت ئێوەش هەوڵدەن لەدڵ و دەروونی خۆتانی بکەنەوە دەرەوە، ئەو لەزیندانیشا هەرگیز لەو داربەدەستانە توورە نەبوو کە بێ هیچ سووچ و تاوانێکی مرۆڤایەتی لێیان دەدا، چونکە ئەو دەیزانی ئەمە فەرمانێکە و لەسەرووی ئەوانەوە دراوە و ئەوان تەنها جێبەجێکاری فەرمانەکەن، بۆیە تاپێی دەکرا ئامۆژگاریشی دەکردن، لەدوای هاتنە دەریشی لەزیندان هەر ناو و روخساریشیانی لەبیرچووبونەوە ... ئەو بەجۆرێك تێکەڵ بە میهرەبانییەتی خوداو رەحمەتییەتی حەزرەت ببوو : خەمی خۆشبەختی و رزگاری دونیا و دوارۆژی خەڵك تاسەر ئێسقان هەموو ژیانی داگیر کردبوو، ئەم داگیربوونەشی بەئەندازەیەك لە دڵ و دەروونیا رەگی داکوتابوو زۆرجار لە موناجاتی گەرموگەشیا لەگەڵ خودایا دەیفەرموو ( خوایەگیان: بۆنەجاتی یەکجارەکی و بۆ خۆشبەختییان ئامادەم

لەجیات تەواوی خەڵکی سەرزەوی بچمە دۆزەخ و بسووتێنرێم ).. لەوەش باڵاتر: دەربارەی ئەوانەش کە سەرپەرشتیاری حکوومی و کاربەدەستی دەوڵەت بوون ( لە بچووکیانەوە تا سەرۆکی گشتی و ڕابەری ڕۆحیشیان ) گەردەنی هەموویانی ئازادکرد و ڕق وکینەیانی لە دڵ هەڵنەگرت، لەهەمووان بەرزتر و گەشتر و ڕۆشنتر، مەردانە و جوامێرانەتر، ئیماندارانە و پەیامدارانەتر، ئەم هەڵوێستەی بوو کە نواندی بەرامبەر بە ئەوانەی کۆمەڵێکی زۆر لە دۆستانی ئازیزیان ئەشکەنجە کوژ کرد و، ئەوانەش (40) دانە لەهاوڕێیانی گیانی بەگیانییان زیندە بەچاڵ کرد فەرمووی : ( خوا شاهیدە نسبەت بەوانیش ڕق وکینە نیە لە دڵما و چۆن بۆ خۆم ئارەزووی ئیمان و فەزیلەت وئاقیبەت خێری دەکەم، ئاوها بۆ ئەوانیشی ئارەزوو دەکەم ) ... کە بەڕاستی ئەمە لوتکەی ئاکار بەرزییە، بە حەق ئەم کردار و هەڵوێستەی کە موفتی زادە نواندی و پیادەی کرد لە دواهەمین قۆناغی ژیانیا شوێن پێهەڵگرتنی ڕاستەقینەی پێغەمبەرانە و تەنها ئەوان توانیویانە لەدوا پلە و ترۆپکی چەمکەکانەوە نمایشی حەقیقەتی پەیامەکان بکەن . حەزرەتی ( ئیبراهیم س )نسبەت بە بتەکان و ئەوانەش کە بە خودایان داناون و ڕێیان لێ شێواوە بەخودا دەفەرمووێ

﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ (إبراهيم:36) واتە دەیەوێ پاسا و پاکانە بۆ خودی سەرلێشێواوەکانیش بهێنێتەوە و تاوانی هاوەڵ پەیداکردن و لادانیان لەراستە شەقامی ئیلاهی بداتە پاڵ بتەکان، بۆیە بەکوڵی دڵ روو دەکاتە خودا و دەڵێ {خوایە گیان ئەوە بتەکانن هۆکاری سەرەکی سەرلێشێواندنی زۆرینەی خەڵکان، بۆیە ئەوەی شوێنی راستە شەقامی هیدایەتی تۆ دەکەوێ لە بەدواهاتنی شوێن هەنگاوەکانی منەوە : ئەوا لەمنە ( لەیەکتاپەرستیدا ) و وەك منە ( لەبەندایەتی وتەسلیم بوون بە خودا و پەیامەکانی )، ئەوەش کە سەرپێچیم لێ دەکا و شوێن ئەو بەرنامە و رێ و شوێنە ناکەوێ کە لەتۆوە بۆم هێناوە، ئەوا تۆ : ( لێبوردەدو میهرەبانی )، وەك ئەوەی بیەوێ لەدڵەوە بەخواگیان بڵێ : ئەم تاوانبارانەش بەدەستی ئەنقەست ئەم کارە نالەبارانەیان نەکردووە و لەکاڵفامی خۆیان بتەکان سەریان لێشێواندبوون و گومرای رێگای راستەقینەی تۆیان کردبوون، کە بەراستی ئەمە لوتکەی خەم خواردنە بۆ رزگاری و خۆشبەختی خەڵکان لە دونیا و دوارۆژدا . یان ئەو مەلائیکەتانەی کە هاتبوون بۆ میوانی و مژدەی مندالبوونیان بۆ هێنابوو، و لەهەمان کات بۆ لەناوبردنی قەومی ( لوط ) سەلامی

خوای لەسەربێ هاتبوون بەهۆی خراپترین کرداریانەوە ( لیواطە )، کەچی تەماشادەکەین حەزرەتی ئیبراهیم بۆ ئەمانیش داوای مۆڵەت پێدانی زیاتردەکات و بۆ دوورخستنەوەی سزا لەسەریان تا ئاستی زۆر پێداگرتن و عوزرهێنانەوە و پاڕانەوە بۆیان کۆڵ نادات، چونکە ئاکاری بەرز و سرووشتیانەی خۆی وابوو : ﴿ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ ﴾ ( هود:75)، خوداش ئەم کوڵی دڵەی دەربارەی قەومی (لوط) لەقورئانا تۆمار کردووە و دەفەرمووێ : ﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ .... ﴾ ( هود:74) ، بۆیە کاك ئەحمەدی موفتی زادە ورد ئەم فەرمایشتەی خواگیانی لەبەرچاو گرتبوو کە بە خۆشەویستمانی فەرموو بوو :﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ .. ﴾ ( النحل:123) بۆیە حەزرەتیش دەیفەرموو: (( بعثت بحنيفية سمحة ))، بۆ ئێمەی ئیماندارانیش خواگیان ئەم سرووشەی خەڵاتی خۆشەویستمان کردبوو: ﴿ قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾.. ( ال عمران:31) بۆیە موفتی زادە بەگەیشتنی بەم ئاستە بەرزەی دەروون و بەپیادەکردن و نواندنی ئەو هەڵوێستە جوامێرانە و مەردانە و پەیامدارانەی چووە سەر لوتکەی چەمك و مەعنای تەساموح و،

بەهۆیانەوە بووە جوانترین نمونەی جێبەجێکاری ئەم پەیامە و شوێن پێ هەڵگرتنی پێشەوا مەزنەکەی کە حەزرەتی فەخری عالەم (محمد المصطفی) یە، بەم هەنگاوەی ئەو خەیاڵەی پووچەڵ کردەوە کە پێی وابوو گەیشتن بەم پلەی ( لێبوردنە رەسەنە ) لە دڵی مرۆڤدا شتێکی مەحاڵە و نایەتە گۆڕەپانی جێ بەجێبوونەوە، بۆ تا هەتاش بووە چرای درەخشانی مەیدانی تەسامح و لێبووردەیی و گەردەن ئازادی لەدوای حەزرەت گیانەوە ..

## پەیامی: فەرموودە ناسیی

ئێمە تا ئێستاش بۆ وەرگرتن و قبوولکردن و بە فەرموودە زانینی هەرفەرمایشتێکی حەزرەت، یان رەتکردنەوەو بە فەرموودە نەزانینی: تەنها پشت بە سەنەد و ریزبەندی ئەو پیاوانە دەبەستین کە هەریەکێك لەئەوەی بەر لەخۆی گویٚ لیٚ بووە و گێڕاویەتیەوە، زۆر کەم ئیش لەسەر مەتن و ناوەڕۆکی فەرموودەکان کراوە و، ئەو دەمەش زۆر جار بووە فەرموودەیەك هاوتەبای سەرجەمی مەطلەب و پەیامەکانی قورئان بووەو لەگەڵ رۆحی باڵای حەزرەت گیان و سەرجەم پەیام وئاکار و رەوشتە بەرزەکانیشی هەماهەنگ بووە، کەچی هەر لەبەر ئەوەی یەکێك لە ریزبەندی ئەو پیاوانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە ( گوایە عەدلی:{واتە ئیمان وتەقوا و ئەخلاقیاتی} و حفظی:{ واتە هۆش و بیرو یادەوەری} لەئاستی پێویست نەبووە)، یان بیرکردنەوەیەکی تایبەتی ئایینی هەبووە ) فەرموودەکەیان لاوازکردووە و بڕیاری کار پیٚ نەکردن و باوەڕ پیٚ نەبوونیشیان بەسەرا بڕیوە، لەبەرامبەردا ڕەنگە

( بەناو فەرمووده ) بووبێ : نە لەگەڵ خواست و پەیامەکانی قورئان و، نە لەگەڵ رۆحی باڵای حەزرەت گیان و پەیام و ئاکارو رەوشتە بەرزەکانیشی هەماهەنگ بووە، کەچی هەر لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەو مەرجانە یەك هاتۆتەوە کە بۆ دروستیی فەرموودەیەکی حەزرەت دایان ناوە: دەبینی فەرموودەکەیان بەڕاست زانییوە و کارپێ کردن و باوەڕپێ بوونیشیان بەخەیرێکی گەورە ناساندووە بۆ ئەوانەی جێ بەجێی دەکەن لەژیانی خۆیاندا، ئەگەرچی بەرهەمیشی نەبووبێ و بگرە زیانی گەورەی کۆمەڵایەتیشی لێ کەوتبێتەوە، بەڕاستی هەقە لەمەولا بەچاوێکی ترو بەنەخشە و پلان و بەرنامەیەکی تر کار لەسەر ناسینەوەی فەرموودە راستەقینەکانی حەزرەت بکەین و بەتەنها لەسەر سەنەد و ریزبەندی گێڕەرەوە بەرێزەکان نەوەستین و، هەوڵدەین ئیش لەسەر مەتن و مەعنا و ناوەرۆکی فەرموودەکان بکەین..لە هەمووان گرنگتریش بۆ ئەو فەرموودانەی پەیوەندیان بە ( ئیمان و کوفر و نیفاق و ئەحکام و... بابەتە بنەڕەتییەکانی تر کە پەیوەندیان بە دیاری کردنی چارەنووسی مرۆڤەوە هەیە.) فەرموودەناسانی سەردەم بە رۆحێکی باڵای گەش و گەرمەوە پەیوەندی بەخودی حەزرەت خۆیەوە بکەن و دروستیی و نـــادروستیی فەرموودەکان لـــە خـــودی خـــۆی پرسیاربـــکەن

( ئەمەش بەهۆی یەکێك لەو هۆکار و رێگایانەی کە لەپەیامی ریسالەتی ( صغری ) ی ئەم کتێبەدا باسکراوە )..

کاك ئەحمەدی موفتی زادە لە ریزبەندی ئەو پێشەوایانە بوو کە پێی وابوو نابێ هەروا بە ئاسان بریاری قبوولْ یان رەتکردنەوە، فەرموودە یان نا فەرموودە، بەهێز و باش و دروست یان لاوازی فەرمایشتەکانی حەزرەت بدەین، بەلْکو لەمەولا جگە لەو مەرجانەی کە بۆ فەرموودەی دروستیان داناوە و زۆرترین یەکلایی کردنەوەیان لەسەر پیاوانی سەنەدەکانە، دەبێ بەقوولْیی لەناو مەعنا و ناوەرۆکدا کاربکەین و بۆئەم مەبەستەش دەبێ باوەر بێنین بەوەی کە مەعنا و ناوەرۆکی هەرفەرموودەیەك کە هی حەزرەت بێ:

- لەگەلْ ئەصلْە هۆکاری هاتنی ئایین بۆ مرۆڤایەتی هەماهەنگە..

- لەگەلْ سەرجەم ( أسماء وأفعال ) ی خوداو، تەواوی پەیامە بنەرەتییەکانی قورئان گونجاوە..

- ئەو باس وحوکمەی کە لەناوەرۆکی فەرموودەکەدا هاتووە: بوون و، بناغەو،ئاماژەی لەقورئانا بەرۆشنیی هەیە، چونکە حەزرەت

رۆشنکەرەوەی پەیامەکانی قورئانە بە رەفتار و گوفتارە شیرینەکانی ﴿ بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل:44)

- ئەو باس وخواست و مەطلەب و حوکمەی کە لەفەرموودەکەدا باسکراوە یەکانگیرە لەگەڵ هەمان ئەو باس و مەطلەب و حوکمە لە قورئاندا..

- لەگەڵ رۆحی بالاّی حەزرەت گیان و سەرجەم ئاکار و رەفتار و گوفتارە شیرینەکانی هەماهەنگە..

- لەگەڵ سروشت و دەروونی نەشێوێنراوی مرۆڤا سازگارە..

- لەگەڵ هۆش و بیری سازگارا ئاوێتەیە..

- لەگەڵ زانستی راستەقینەدا هیچ دژایەتیەکی نیە..

- لەگەڵ بەرژەوەندییە دروستەکانی مرۆڤا ناتەبا نییە..

- راستە کەم و زۆرێك وشەو دەستەواژەی گێڕەرەوەکانی تێکەوتووە، بەڵام لە ( کل-گشت ) دا وشەو دەستەواژە و ئاماژەکانی حەزرەت گیان تایبەتن و نزیکایەتییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ وشەو دەستەواژە و ئاماژەکانی قورئان و، زۆر جودانە لە وشەو رستەی خەڵکانی تر..

خۆ ئەگەر فەرموودەیەك لەگەڵ یەکێك، یان تەواوی ئەم خەسڵەت و پێناسانە یەك نەهاتەوە ئەوا باشتر وایە لێی بوەستین و هیچ نەبێ بە ( فەرموودەی حەزرەت) بەخەڵکی ئاشنا نەکەین، ئەوە جگە لەوەی دەبێ لەگەڵ فەرموودە دروستەکانیشا بە وردیی مامەڵە بکەین، چونکە بەشێکی زۆر لە فەرموودەکانی حەزرەت پێویستیان بە حیکمەت و شارەزاییەکی ورد هەیە لەپیادەکردن و بەکردەوەکردنیان، چونکە زۆرێکیان بەپێی ئاستە دەروونیەکانی مرۆڤ و هەل و مەرج و کات و شوێنی جودا گۆڕانیان بەسەردا دێت ، چونکە وەك چۆن سورەت و ئایاتی قورئان ( مەککەیی و مەدینەیی )ان هەیە : ئاوها بەهەمان شێوەش فەرموودەکانی حەزرەت مەککەیی و مەدینەییان هەیە و دەبێ بزانین کەی ؟ وچۆن؟ پیادە و بەکردەوەیان دەکەین.....

# پەیامی: ئیمان و کوفرو

## جەنگی ئیسلام لەگەڵ ناموسڵمانانا

چەمکی ئیمان و کوفر دوو چەمکن: چەندە پەیوەندیان بەناخ و سروشتی مرۆڤەکانەوە هەیە، ئەوەندەش پەیوەندی بەچارەنووسیانەوە هەیە لە دونیا و دوارِۆژدا. ئەم دوو چەمکە دوو بەکاربردەی ئیلاهین و تەواوی پەیامە ئاسمانیەکان باس و خواسی وردیان دەربارە کردووە، شتێك نیە تایبەت بێت بەدواهەمین پێغەمبەری خوا حەزرەتی (محمد) سەلامی خوای لەسەربیّ و تەنها قورئان باسی لێوە کردبێت، بەڵکو هەموو پێغەمبەرانی خودا سەلامی خودایان لەسەربێت دەعوەت و تەبلیغی پەیامی خودایان بە کۆمەڵگاکانی خۆیان راگەیاندووە و بە ئەوپەری حەققانیەتی حەققەوە و، لەترۆپکی ئاستی بەرزی پەیامەکانیشا چەشنی نموونەیەکی عەمەلی خۆیان نیشانی مرۆڤایەتی داوە .. جائەوانەی قبوولّی پەیامە ئیلاهیەکانیان کردبیّ و باوەڕیان پێی

هێنابێت وشوێن کەوتەی پێغەمبەرەکان بووبن : ئەوا بوونەتە ئیماندارو ، ئەوانەش کە بەئاگاهی رەتیان کردبێتەوە و رووبەڕووشی بووبنەوە : ئەوا بوونەتە کافر و سەرەنجام دونیا و دوارۆژی خۆیان دۆڕاندووە .. ئەم دوو چەمکە زۆر بەئاشکرا لە قورئانا باسیان لێوە کراوە و خەڵکانیکی زۆریش لەلێکۆڵەرەوانی ئایین و تەفسیرکارانی قورئان پێناسی جۆراوجۆریان دەربارە کردووە .. قورئان پەیامی خودایە و خوداش تاکە و یەك تاکە مانای راستەقینەی داواکراویش لەچەمکەکان هەیە، وەلێ مرۆڤەکان ملیۆنەهان و خاوەن هەزارەها بیر و بۆچوونی تایبەت بەخۆشیانن وشتێکی سرووشتیشە کەوابێ، چونکە مرۆڤەکان لەیەکتر جیاوازن و هەریەکەیان خاوەن بیر و هۆشێکی تایبەت و سروشتێکی تایبەت و ئاستێکی دەروونی تایبەت و ژینگەیەکی تایبەت بەخۆیانن، هەموو ئەم جیاوازیانەش وایان کردووە جیاوازی بکەوێتە بیر و بۆچوونەکانیانەوە دەربارەی ئایین بەگشتی و قورئان بەتایبەتی و ئەم دووچەمکەش زۆر تایبەت تر، هەبوونی ئەم جیاوازیانە وایان لەپەیڕەوکارانی ئایین و ئیسلام و قورئان کردووە دابەش ببنە سەر بیر و بۆچوونەکان و هەریەکەیان بەپێی نزیکییان لەبیر و هۆش و سروشت و دەروون و ژینگەی خۆیان یەکێك لەبۆچوونەکان بکەنە سەرمایەی دڵ و

هۆشیان و هەم خۆیان لەسەری پابەندبن و هەمیش بانگەشەی حەقانیەتی بۆبکەن..کاك ئەحمەدی موفتی زادە یەکێکی ئەو خاوەن بۆچوونانەیە کە بەهەق توانیویەتی لەڕۆحی مەطلەبی ئیلاهی و ئەصڵەمانای ئەم چەمکانە لەپەیامی قورئانا نزیك بێتەوە و ورد لە بنج و بناوانیان حاڵیی ببێت و هەم خۆیشی بەپێی ئەم تێگەیشتنانە ڕەفتاربکات و هەمیش بانگەشەی بەخێر و حەکیمانە بۆ ئایین بەگشتی و قورئان بەتایبەتی و ئەم دووچەمکەش زۆر تایبەت تر بکات.. بەر لە هەرشتێك کاك ئەحمەد وەها لەئایین و پەیامەکانی قورئان حاڵیی ببوو: کەمەرج نیە هەرکەس موسڵمان نەبوو ئیدی دەبیٚ کافربێت، وەهەرگیزیش مەرج نیە کە ئەگەر کۆمەڵگایەك موسڵمان نەبوو، تەنانەت ئەگەر کافریش بوو ئەوا ئیسلام شەڕی لەگەڵدا بکات لەسەر ئەوەی کە موسڵمان نیە، ئەصڵەن شەڕێك بەناوی ئیسلام و کوفر ( تەنها لەبەر کوفرەکەیان ) وجوودی نیە، درێژەی ئەم باس وخواسانە کاك ئەحمەد بەم جۆرە پێناسەیان دەکات:

**(ئیمان)**: بریتی یە لەخۆشهاتن لەحەقق ( بەمانای خودا و رۆژی دوایی و مەلائیکەتانی و کتێبە پیرۆزەکانی و پێغەمبەرە بەڕێزەکانی )

و هەروەها قبوولکردنیان و بەدڵ تەسلیم بوونیان و خۆشویستنیان و هەوڵ و تەقەلاو تەکان دانیش بۆ پاریزگاری و بەرگری لێکردنیان..

(**کوفر**) یش: بریتی یە لەخۆشیی نەهاتن لە حەقق و تەسلیم نەبوون پێی و خۆشنەویستنی و داپۆشتنی و ئاگاهانە ڕووبەڕووبوونەوە و لەبەرامبەر وەستانی..

{**ئیماندار**}:کەسێکە قبووڵی حەققی کردووە و خۆشی دەوێ و تەسلیمە بەسەرجەم پەیامەکانی و بەهۆیانەوە دڵ وگیانی گەشەو نەشونما پێ دەکات و تا ئاستی لەپێناو دانانی تەواوی بەرژەوەندیە دروستەکانی و تەنانەت گیان بەخشینیشی بەرگریان لێ دەکات..

{**کافر**}یش:کەسێکە تەواوی حەققانیەتی حەققی بۆ ڕۆشن بۆتەوە و باش باش لێیان حاڵیی بووە و تائاستی بە ( ماددی بوون و جەستەبەربوونی حەق) ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَ وَقَدْ تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنْ مَسَاكِنِهِمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ﴾ (العنكبوت:38) بینیویەتی و، دوایی ئەم حەققەی داپۆشتووە لەبەر هەرکام لە بەرژەوەندیە ناتەندروستە ماددی و مەعنەویەکانی و، پاشان

ئاگاهانە بڕیاری شکست پیٚ هیٚنانی داوە و بە زمان و دلّ وگیان و لاشەشی ڕووبەڕووی بۆتەوە..

لەبەرامبەر ئیسلامیشا : بەتەنها کوفر بوونی نیە، بەلّکو ئەوانیش دابەش دەبنە سەر سیٚ دەستەی سەرەکی لەیەکتر جوداوە :

1-{**کافر**} : ئەوەیە وا تەواوی حەققی بۆ ئاشکرا بووە و پاشان ئاگاهانە ڕووبەڕووی بۆتەوە..

2-{**موونافیق**} : ئەوەیە وا بەتەواوی حەققی بۆ ڕۆشن بۆتەوە و لە دلّ و دەروونیدا ڕقی لیٚی دەبیٚتەوە و تەسلیمی نابیٚت لە ناخیدا و ،هەرچەندی پیٚشی بکریٚت ململانیٚ و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەلّدا دەکات، بەلاّم لەبەرگ و ڕووخسار و نواندنی ئیسلامەتیدا..

3-{**ئەهلی فەترە**} : ئەوەیە وا هیٚشتا تەواو حەقق و پەیامی ئیلاهی بۆ ڕۆشن نەکراوەتەوە و هیٚشتا بەدروستی و سەرتاپاگیری نازانیٚ سرووشی ئیلاهی و پەیامی ئایین ( چی ) یە و( چی ) یشیان لە (ئەو) داوایە؟، ئەو دەمە بەئارەزووی خۆیان یان بوونەتە نەصڕانی، یان

یەهوودی، یان لەسەر داب ونەریتی باوباپیرانیان لەسەر بت پەرستی و ( شرك = هاوبەش پەیداکەریی ) ماونەتەوە..

کاك ئەحمەد پێی وابوو نەك هەر لەبەرامبەر ئیسلام و موسڵمان بووندا تەنها کوفرو کافریی بوونی نیە، بەڵکو ( کوفرو نیفاق و فەتری بوون ) هەیە، لەهەمان کات دا: کوفر و کافرانییش یان راستتر وایە بڵیین ناموسڵمانانیش یەك جۆر و یەك هەڵوێستیان نیە، بەڵکو ئەوانیش دابەش دەبنە سەر سێ دەستە و سێ جۆر هەڵوێستی جوداشیان هەیە:

1- کافر یان ناموسڵمانی{محارب = شەڕخوازوشەڕکار} ) :
ئەوەیە وا بەریست و هەڵبژاردەی خۆی و بەهەموو هێزێکی ماددی و مەعنەوی خۆیەوە هەموو جۆرەکانی چەکی بەرامبەر بەئیسلام و موسڵمانان بەرزکردۆتەوە..

2- کافر یان ناموسڵمانی{ذمی} ):ئەویش ئەوەیە وا لەسەر زەمین و لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ئیسلاما ملکەچانە پەیڕەویی لەدەستووراتی ئیسلام دەکات..

**3- کافر یان ناموسڵمانی{معاهد= پەیمان لەگەڵ بەستراو}:**
ئەویش ئەوەیە کە قبوولّی موسڵمان بوونی نیە، بەڵام پەیمانی هەیە لەگەڵ موسڵمانانا، لە نزم ترین ئاستی پەیمانەوە : کەشەڕ نەبوونە لەنێوانیان تا هاوکاری یەکترکردن و زانست گۆڕینەوە و بازرگانی کردن لەنێوانیان و تەنانەت بەرگری کردن لەبوون و قەوارەی یەکتریش..
جا ئێستا ئەگەر بێینە سەر جەنگی نێوان ئیسلام و ناموسڵمانان، ئەوا کاك ئەحمەد پێی وابوو هەرگیز شەڕێك بوونی نیە لەنێوان ئیسلام وکوفر، یان ئیسلام و ناموسڵمانانا تەنها لەبەر کوفر یان موسڵمان نەبوونیان، چونکە ئیمان و ئیسلام بوون شوێنگەیان دڵە و ئارەزوومەندانەش مرۆڤ لێیان نزیك دەبێتەوەو، دەبێ لەدڵ وگیانیشیا جێ نشین بێت و خۆشی بوێت و پێی رازی بێت و پاشان تەسلیمی بێت و لەخۆی و ژیانی رۆژانەشیدا رەنگیان پێ بداتەوە، دیارە ئەم کردارەش هەرگیز بە تۆبزی کاری و بەهێزی ماددی یان مەعنەوی بەرهەم لە وجوودی مرۆڤا پەیداناکات، خۆ ئەگەر زیاد لەپێویستیش ناچاربکرێت ئەوا مرۆڤ هانا بۆنیفاق دەبات ( واتە لەدڵ و دەروونیا هەتا بڵێی رقی لێی دەبێتەوە و باوەڕی پێی نیە و پێشی رازی نیە، بەڵام لەترسانا یان لەبرسانا وانیشان دەدات کە قبوولّی کردووە، ئەم حاڵەشی

نەهیچ سوودێك بەخۆی دەگەیەنێ لای خودا و لەدوا رۆژا، نەموسڵمانانیش قازانجی لێ دەکەن.. بەواتە شەڕی ئیسلام لەگەڵ کافر یان ناموسڵمانانا لەبەر کوفر یان موسڵمان نەبوونیان نیە، بەڵکو لەبەر یەکێك لەم هۆکارانەی خوارەوەیە:

یەکەم: هێزێکی کافر یان ناموسڵمان کۆببنەوە و بەتەواوی ئامادەیی ماددی و مەعنەوی خۆیانەوە هێرش بکەنە سەرموسڵمانان و شەڕ و کوشتاریان لەگەڵدا بکەن و بیانەوێ لەڕەگ و ڕیشەیان بهێننە دەرێ، ئەوکاتە ناچار ئیسلام و هێزی موسڵمانان لەبەرامبەریان دەوەستن و بەرگری لەئایین و ئیمان و قەوارەی خۆیان دەکەن: ﴿ وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ.. ﴾ (البقرة:190)، بەواتە شەڕی کافرو ناموسڵمانان هێرش هێنانە و هی ئیسلام و موسڵمانانیش بەرگری کردن..

دووەم: فەرمانڕەوایی کافر یان ناموسڵمانان لەسەر زەمین و سنوور و وڵاتی خۆیانا ئازار و ئەشکەنجەو کوشتاری ئەوموسڵمانانە بکەن کەنیشتەجێی خاك و ئاوی ئەوانن و بیانەوێ ناچار بەهەڵگەڕانەوە و دەست و دڵ بەردان لەئایین و پەیامی ئیسلامیان بکەن، ئەو

ئەشکەنجەو ئازارو کوشتارەشیان تەنها لەبەر موسڵمان بوونیان بێت و هیچ پاساوێکی تەندروستی یاسایی و ئەخلاقی ( فەردی و کۆمەڵایەتی) ان بەدەستەوە نەبێت بەسەریانەوە، ئەو دەمە ئیسلام و هێزی موسڵمانان دوو رێگا چارە دەگرنەبەر بۆ رزگارکردنی ئەو موسڵمانانە لەدەست جەور و ستەمی ناموسڵمانەکان:

1- ئەگەر ئەو سەرزەمین و سنوورو وڵاتەی کەموسڵمانەکانی تیا ئەشکەنجەو ئازار دەدرێت دراوسێ و تەك بەتەکی سەرزەمین و سنوور و وڵاتی ئیسلام و موسڵمانان بوو ئەوا هێزیان بۆکۆدەکرێتەوە و بڕیاردەدرێت یان دەست هەڵگرن لەئازاردانی موسڵمانەکان یان شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت تاشکست دەخۆن و موسڵمانەکان سەربەرز دەبن و بەدڵ وگیان و لاشە ئازادانە خواپەرستی خۆیان دەکەن: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴾ ( التوبة: 123)

2- ئەگەر ئەو خاك و سنوورو وڵاتەی ئەشکەنجە و ئازاری موسڵمانانی تیا ئەنجام دەدرا دراوسێ نەبوو لەگەڵ خاك و هێزی ئیسلام و موسڵمانان ئەوا ناکرێت بە هیچ شێوەیەك خاك و سنووری وڵاتێکی تر

بەزێنن و نەهامەتـــی و پشێـوی و نائـارامی و زیـان بگەیەنـن بەکۆمەڵگاکەیان، چونکە ناکرێت تۆڵەسەر حیسابی مەرگی کەسێکی بیٚ تاوان ژیانی کەسێکی تر رزگار بکەیت، بەڵکو ئەو دەمە داوا لەموسڵمانانی ئەو خاك و سنوورە دەکرێت کە ئەشکەنجەو ئازاریان تیا دەدریٚ: کۆچ بکەن و لەو خاك و نیشتیمانە نەمێنن و بێنە ناو سنوور و خاك و فەرمانڕەوایی ئیسلام وموسڵمانانەوە، ئەگەر لەو پێناوەشدا زۆرێك لەبەرژەوەندی و سەروەت و سامانەکانیشیان لەدەست بدەن..

سیٚ یەم: دواهەمین شەڕ کە ئیسلام و موسڵمانان لەناو خۆی خۆیانا (واتە لەناو سەرزەمین و سنوور و فەرمانڕەوایی ئیسلاما) رووبەڕووی دەبنەوە لەگەڵ ئەوانەیە وا بەبیٚ هیچ پاساو و ماف پێشێل بوونێکی ئایینی یان ئابووریٖ یان ئەخلاقی { فەردی یان کۆمەڵایەتیان} لەحکوومەت و دەسەڵات و دەستووری ئیسلام و موسڵمانان هەڵدەگەڕێنەوە و رووبەڕووشیان دەبنەوە {کە زووتر بڕیارو پەیمانیان دابوو هاوشێوەی دەستووراتی ئیسلام زیندەگی بکەن} ، ئەو دەمەش جارێکی ترو سەرلەنویٚ حەقیقەتی ئیسلام و پەیامەکانی ئایین و قورئانیان بۆ رادەگەیەنرێتەوە و مۆڵەتیشیان پیٚ دەدرێت کەبیربکەنەوە،

ئەگەر لەم بەگژداچوون و هەڵگەڕانەوە و یاخی بوونە بێ پاساوەیان پەشیمان بوونەوە ئەوا باشە و وەكو جاران حورمەت و مافەكانیان پارێزراوە، خۆ ئەگەر هەر پێ داگیربوون لەسەر هەڵگەڕانەوە و یاخی بوون و شەڕخوازی خۆیان، ئەوا ناچار دەكرێن كەلەم فەرمانڕەوایی و خاك وخەڵكەی ئیسلام وموسڵمانان بچنەدەرەوە و شوێنگەیەكی تر بۆ زیندەگیی خۆیان هەڵبژێرن و لەوێدا ئازادانە بۆچوونە ناتەندروستەكانی خۆیان پیادەبكەن .. خۆ ئەگەر لەیاخی بوون و شەڕخوازی خۆیان دەست و دڵیان هەڵنەگرت و نەشچوونە دەرەوە لەسنوور و فەرمانڕەوایی موسڵمانان ئەوا بەناچاری شەڕیان لەگەڵدا دەكرێت تا ناچاردەكرێن یان ملكەچی دەستووراتی ئیسلام زیندەگی دەكەنەوە یان لەخاك و فەرمانڕەوایی ئیسلام و موسڵمانان دەچنە دەرەوە.

**بۆ هەموو شەڕەكانیش چەند حوكمێكی بنەڕەتی ئیلاهی پیادەدەكرێت:**

1- ئەوانەی لەشەڕدان و بەهیچ جۆرێك كۆڵ نادەن و چەك دانانێن ئەوا شەڕوكوشتاریان لەگەڵدا دەكرێت تا دەكوژرێن..

2- ئەوانەش وا دوای ئەوەی شکست دەخۆن و بەریسوایی، دوای نەمانی هیچ ڕێگا چارەیەکیان دەکەونە دەست موسڵمانان ئەوا دەکرێنە سیّ بەشەوە و هەریەکەشیان حوکمێکی جودا و تایبەت بە خۆیان بۆدەردەکرێت:

**یەکەم-** ئەوانەی بەدڵنیاییەوە دەزانرێت کەلەشەڕدا خەڵکیان کوشتووە ئەوا دەکوشترێنەوە.

**دووەم-** ئەوانەی بەدڵنیاییەوە دەزانرێت خەڵکانیان بریندار و کەم ئەندام کردووە ئەوا بریندار و کەم ئەندام دەکرێنەوە لەتۆڵەیاندا.

**سیّ یەم-** ئەوانەش کە بەدڵنیاییەوە دەزانرێت نەخەڵکیان کوشتووەو نەکەسیشیان زامار و کەم ئەندام کردووە:(ئەگەر سەربازی ئەو لەشکرە بوون کە وڵاتی نامووسڵمانانەی تایبەت بەخۆیان هەیە) ئەوا بە پێی بارودۆخی تایبەتی شەڕەکە:یان زیندانی دەکرێن بۆماوەیەك، یان بەبڕیّ سەروەت و سامان دەدرێنەوە کەس وکاریان، یان دەگۆڕدرینەوە بەدیلە موسڵمانەکان، یان دەکرێنە فشار بۆ دابینکردنی بەشیّ لە بەرژەوەندییەکانی موسڵمانان، یانیش بیّ بەرامبەر ئازاد دەکرێن و

پەیمانیان لیٚ وەردەگیردریٚ کە جاریٚکی تر بەشداری شەڕی دژ بە موسڵمانان نەکەنەوە..(ئەگەر سەربازی ئەو لەشکرەش بوون کەلەسەر زەمین و سنووری ئیسلام و موسڵمانان دەژیان) ئەوا دوور دەخریٚنەوە بۆشوێنیٚك کەئیتر جاریٚکی دی هیٚزو دەسەلاٚت پەیدا نەکەنەوە بۆ بەگژداچوونەوەی ئیسلام و موسڵمانان: ﴿ إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ...﴾ ( المائدة:33)

(تیٚبینی: ئەم حوکمەی دوایی کە بۆ شەڕانگیٚزانی ناو سنووری ئیسلام و موسڵمانانە دەرحەق بەکەسانیٚك جیٚ بەجیٚ دەکریٚت کە بەبیٚ هیچ پاساویٚکی تەندروستی ئایینی و کۆمەلاٚیەتی و ئابووری لەپەیام و دەستوور و لە پیٚشەواو حکوومەتی بەحەقی ئیسلام و موسڵمانان هەڵدەگەڕیٚنەوە، نەك پیٚچەوانەکەی .. بەداخەوە بەدریٚژایی میٚژووی موسڵمانان حکوومەت و پیٚشەوا گەلیٚکی ناشایستەی بەناو ئیسلامی بەشمشیٚری ئەم ئایەتە نەیارانی خۆیان پاکتاو کردووە کە لە ستەم و سەرپیٚچی و پیٚشیٚلکارییەکانیان هاتبوونە دەنگ و داوای مافە ڕەواکانی خۆیان و موسڵمانانی ستەمدیدەیان لیٚ دەکردن..!

# ریسالەتی ( کبری ) و ریسالەتی ( صغری )

# یان

# ریسالەتی ( عام ) و ریسالەتی ( خاص )

خۆشویستنی پێغەمبەر(سەلامی خوای لەسەر بێت) پایەیەکی پتەوە لە پایەکانی ئیمان لای ئیمانداران و هۆیەکی سەرەکیشە بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی خودا و رزگاری و خۆشبەختی لەدونیا و دوارۆژدا، کاك ئەحمەد لەخۆشویستنی حەزرەتا بەجۆرێك بەقوولایی مەحەببەتیا رۆچووبوو : نەك هەر لەنزیکان و دۆستان وخانەوادە و جگەرگۆشەو لەخۆیشی خۆشتر دەویست، بەڵکو درەختێکیش کە (حەزرەت بەدەستی خۆی ناشتوویەتی) ئامادەیە ئەگەر ئیختیار بکرێت لەنێوانی ئەوەی ئەو تاقە جگەر گۆشەیەی کە هەیەتی (محمد ژیان) بمریّ ولەبەین بچیّ و لەنێوانی ئەوەی کە گەڵایەك لەو درەختە بوەریّ !! ئەم ئامادەیە

ئەوەیان هەڵبژێرێ کە سەختە لەسەر دڵ ودەروونی باوکانا و مایەی جەرگبڕینە بەڵام یەك تاقە دانە لەگەڵای ئەو درەختە موبارەکە نەوەرێ، بۆیە دەبینرا هەرکات کە ناوی موبارەکی حەزرەت گیان بەسەر دڵ وخەیاڵ وگوێچکە و زمانیا گوزەری بکردبوا : موچرك هەموو گیانی دەهەژاند و بەکوڵی دڵی دەگریا و هەنسکی قووڵی دڵ وگیان هەناوی سوتاوی هەلاهەلای ئەوین دەکرد، ئەو خۆشەویستیە گەرموگەشەشی چەشنی کراسێك کراوە بەبەر زۆرینەی شیعرەکانیا و ئاسان خۆیان دەخەنە بەردڵ و دیدەی خوێنەرانی، ئەو لەخۆشەویستی زۆری بۆ حەزرەت گیان ویستی سەر لەبەر ژیانی موبارەکی خۆشەویست بنوسێتەوە بە شیعرو بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵی گەرم وگەشی خۆیدا، بەڵام بەداخەوە سەرقاڵبوونی بۆ خزمەتی خەڵك و زیندانبوونی و نەخۆشی و مەرگ نەیانهێشت ئەم ئاواتە لەدڵاشیرینەی بهێنێتە دی و ، هەرتەنها توانی چەند بەشێکی کەم لەژیانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە بەشیعر تۆماربکات، بەڵام بەهەق کە تەماشای ئەو بەشە کەمە لەژیانی حەزرەت گیان دەکەی کە ئەو بەرێزە نووسیویەتی دەبینی پڕە لە وردبینی وجوانی و نهێنی، لێوڕێژیشە لە بەرەکەت و رەحمەتی ئیلاهی ... جگە لەم مەولود نامەیەش چەندین شیعری جوانی هەیە

دەربارەی حەزرەت گیان ویەکێك لە جوانترینی ئەو چوارینانەی کە بۆ ئەو خۆشەویستە زۆر خۆشەویستەی خۆی نووسیوە ئەو چوارینە شیعرەیتی کە لەزیندانا ولەناو ئێش و ئازاری (جەستە ودەروون) ولەناو حەسرەتی دووری یارانی وخەمی قوڵی تەنیایی خۆی بەدەم ئازارەوە رووی دڵی خۆی کردۆتە حەزرەت گیان و بەکوڵی دڵ پێی فەرمووە :

( لەجەرگەی جەمی یارانی گیانی

تۆم نەبیْ هێشتا خۆم پیْ تەنیایە

تۆم هەبیْ تەنها لـــە إنفرادی

لێم جەمە هەرچیْ خۆشـی دنیایە )

ئاڵۆزترین و سەختترین و لوغزدارترین پەیامێك کە کاك ئەحمەد بڵاوی کردبێتەوە ( ریسالەتی کبری وریسالەتی صغری ) یە.. ریسالەتی کبری رۆشنە کە مەبەست پێی (23) ساڵی گەیاندنی پەیامی خۆشەویستە بە خەڵکان ولەرۆژی ناو ئەشکەوتی (حیراء) بە (إقرأ )دەست پێ دەکات و بەفەوتی موبارەکی کۆتایی پێ دێت، ریسالەتی (صغری) ش بریتیە لە بەردەوام بوونی ئەم پەیامەی پێغەمبەر بۆ کەسانی تایبەت و بەشێوەیەك کە خواگیان رۆحیانیەتی حەزرەت هاموشۆ پێدەکات بەناو کەسە تایبەتەکان و پەیامەکانیان پێ رادەگەیەنێ و ئاراستەیان دەکات بەرەو راستە شەقامی هیدایەت و لە هەر لادان و نەپێکانێکیش ئاگاداریان دەکاتەوە ... ئەم بابەتە لە کۆنەوە قسەوباسێکی درێژخایەنی گەرم وگەشی عیلمی وعەقیدەیی لەنێو پێشەواو بیرمەندانی ئیسلامی دروست کردووە و نەیانتوانیوە بگەنە هاوڕاییەك لەدانپیانان یان رەتکردنەوەی ئەم بابەتە، چونکە ئەم بابەتە پەیوەندی بە بەش و بازنەی ( رووح و ئەمر و مەعنەویات و غەیبیاتەوە ) هەیە و ئاسان ئیحاطە نادرێ ... ئەهلی عیرفان بەیەقین و دامەزراوی پێ لەسەر حەقیقەتی ئەم بابەتە دادەگرن و بوتە شتێکی باوەڕ پێ هێنراو لەلایان و ئاسان لەدڵ و دەروونیان جێی بوتەوە، ئەهلی مەعریفەش زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەم

بابەت و بیرکردنەوانە دەدەنەوە و، پێناسەی توندیش بۆ بابەتەکە و باوەڕپێهەبووەکانی دەکەن و زۆرجار دەیانخەنە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و ئیمانیشەوە، لەو نێوانەش دا کەسانێك هەن بیر و بینشیان بەقووڵی لەناو دەریای ظاهری شەریعەت و پەیامەکانی و فەرمایشتەکانی حەزرەتە و دڵ ودەروونی گەرم وگەشیشیان کانی سازگاری عیرفانە و تا سەر ئێسقان نوقمی بەخششە مەعنەویە ئیلاهیەکانن، ئەمانە کە بەرووکەش سەر بەهیچ یەکێ لەم دوو ڕێبازە نین و ئەم بابەتی ریسالەتی (صغری) یەشیان بۆ پێش هاتووە و پەیوەندی گەرم و گەشیشیان بەحەزرەت گیانەوە هەیە و پەیامی پیرۆزی لەدەست و دەم و دڵ وەردەگرن : بوونەتە مایەی دیراسەی هەردوو ڕێباز و موراجەعەی دەروونیشی پێ کردوون . چونکە ئەهلی مەعریفەی ئایینی پێیان وایە شەریعەت ( واتە: دەق و پەیامەکانی خودا لەقورئان و فەرمایشتەکانی حەزرەت لە سوونەتا) لەسەر ظاهین و هەرکەس ئەهلی سوننەت و جەماعەت بێ دەبێ نەك هەر باوەری بەم بابەتە نەبێ، بەڵکو دەبێ بەتوندیش رەتیی بکاتەوە، کەچی ئەمان نەك هەر رەتی ناکەنەوە بەڵکو باوەڕیشیان پێی هەیەو لەناویشی دا دەژین و بڵاویشی دەکەنەوە بەدەوروبەری خۆیاندا، لەبەرامبەردا ئەهلی عیرفان

پێیان وایە هەرکەس بەم رێچکە و رێبازە گوزەر (الی الله) نەکات و وردو درشتی ذیکر ورێنماییی وعیبادەتەکان بەو شێوازە ئەنجام نەدات کە ئەمان دیاریان کردووە، ئەم بابەتی (ریسالەتی صغری) یەی خەلاّت ناکرێ، کەچی ئەمان سەر بە وردو درشتی ئەم رێبازەش نین و ئەم حەقیقەتەشیان بە واقیعی و کردارەکی خەلاّت کراوە ... کاك ئەحمەدی موفتی زادە یەکێکی ئەو دەگمەنانەیە کە تاسەر ئێسقان باوەڕی بەم بابەتە هەبوو، و بەخۆیشی یەکێکی ئەوانە بوو کە ئەم خەلاّتەی لەگەلْ کرابوو، حەزرەت گیان (بە إذن= رێپێدانی خودا) پەیامی تایبەتی بۆ دەهێنا و بەرەو خێر ئاراستەی دەکرد . ئەو باوەری وابوو کە پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) دووجۆر پەیام گەیاندنی هەیە و بۆ تاهەتاش بەردەوامیان هەیە و درێژ دەبنەوە بەرەو ئایندە کە ناوی نابوو (ریسالەتی کبری و ریسالەتی صغری) یان (ریسالەتی عام و ریسالەتی خاص)، پێی وابوو وەك چۆن حەزرەت لە (ریسالەی کبری یان ریسالەی عام) دا لەماوەی (23) سالْ بە فەضلی خودا و هیممەتی پێغەمبەرانە و مەردانەی خۆی تەواوی ئەو پەیامانەی کە (قورئانە) بە ئەمانەتەوە گەیاندە مرۆڤایەتی و بەفەرمایشتە بەنرخەکانیشی رۆحی مەطلەب و مانا و مەبەست و گەوهەری ئەم شەریعەتەی رۆشن کردەوەو

پەنهان ونهێنییەکانی ئاشکرا کرد، بەهەمان شێوە لە (ریسالەتی صغری یان خاص) یشدا لەسەر گەیاندنی پەیامەکانی بەردەوامە، بەلاّم ئەمجارەیان بەئاشکراو بۆ سەرجەمی مرۆڤەکان نییە، بەڵکو بۆ کەسانێکە کە لەدلّدا ئیمانێکی گەرم وگەش وگەورەیان هەیە، یان بانگەواز کارن و پێشەوا گەلێکی دڵسۆزن و لەسەر هێڵی راستەقینەی خۆین وخاوەن هۆش و دڵێکی درەوشاوەن و مەردانە و جوامێرانە شوێن هەنگاوەکانی (رەحمەتیەتی) ئەو کەوتوون و لێبڕاوانەوە ولەخۆ بوردووانە خزمەت بە دینی خوا وخەڵقی خودا دەکەن،

حبيبى لقلب العين تنبض بالهوى

وبالحب روح القلب فى وكرها تجري

بكم كم أتى الحيران للحق رحمة

فرحمة رب العالمين كما تدري

رسالتك الكبرى بلغت كمالها

ولكن ترى ( قطبا ) هدى أكبر الفطر

اذا لم تلق عين التوى بقدومكم

فدار الهوى قرت على الحب والقدر

بەڵێ بۆ ئەوانەش دیدارو پەیامی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ وردتر قسەکردن لەسەر حەقیقەتی سەرجەم ئاماژە و ئاراستە و پەیامەکانی ئایین و قورئان، ئەمەش لەرێگای یەکێك یان هەموو ئەم کەناڵانەی خوارەوە :

یەکەم : لەرێگای دەروون وکەوتنە دڵەوە: ئەمەش بریتیە لەو کەناڵەی کە خاوەنەکەی لەهەنگاونانی (الی الله) ی خۆیدا ئەوەندە راست و دروست و پێکاو هەنگاو هەڵدەگرێ و ئەوەندە لەمەبەست و پێداویستی و داخوازی و گەوهەری پەیامەکان نزیك دەبێتەوە تاوای لێ دێت هەموو پەنهانەکانی ئایین و مەرامی راستەقینەی فەرمایشتەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت و ئەصلە مەطلەب لەپەیامەکان دەدۆزێتەوە ... ئەمەش بەزانیاری زۆر و وردو هەمەچەشنی بوارەکان و دڵی گەش وگەرم و ناسینی هۆکاری راستەقینەی هاتنی ئایین بۆ مرۆڤایەتی ... ئیدی کە گەیشتە ئەم پلە لە ناسین و تاوتوێ و

مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ پەیامەکان: ڕۆحی تێکەڵ بەڕۆحی موبارەکی حەزرەت گیان دەبێت و بە چەشنێك هاو مەشرەب دەبێت لەگەڵیدا وەك ئەوەی لەدابەزینی هەر پەیامێکی خواو لەدرکاندنی هەر فەرمایشتێکی حەزرەتا خۆی لەوێدا بووبێ کە حەزرەت ئەصڵە مەتڵەبی ڕۆشن کردبێتەوە و گەیاندبی بە یار و یاوەرانی، بەواتا خودا جارێکی تریش سەرجەم ئەو مانا ڕاستەقینانەی کە پەیامەکان هەیانە و ڕۆشن بوونەتەوە لەناو دڵ ولەسەر زاری حەزرەتەوە سەرلەنوێ دەیخاتەوە دڵی ئەو کەسەوە.

دووەم: <u>لەڕێگای خەونەوە</u> : ئەمەش ئاشکرایە کە حەزرەت گیان (سەلامی خوای لەسەر بێت) لەڕێگای خەونەوە بە ئیزن و ڕێپێدانی خوا وردو درشتی مەبەست و مەرامەکانی پەیامی خواو فەرمایشتەکانی خۆی بە( کەسە دڵسازگارەکە) حاڵیی دەکات و شوێن هەنگاوی دروستی پێ هەڵدەگرێ، بەواتە لە چیەتی پەیام وفەرمایشتەکان و لە چۆنیەتی پیادەکردنیان ئاگاداری دەکاتەوە :

ا عومریّ خەوەری و تەلاش فدای تاویّ خەو

زینگ بەشەپۆلی گۆشە چاوێکی تۆ

صەد ساڵی صەفای رەفاقەتی ئازیزان

قوربانی هەوای خزمەتی تاوێکی تۆ )

سیّ یەم: لەرێگای خەیاڵ وخەیاڵ لێکردنەوە : خەیاڵ بەشێکی گرنگ لە بوونی مرۆڤ پێکدەهێنیّ و توانستێکی سەراسیمەی بەهێزیشی بە بەرداکراوە بۆ ناسین و پەیوەندی بەستان بە شتانێکەوە کە پێویستیان بە تێپەڕاندنی واقیع و زەمان ومەکان هەیە بۆ حاڵیی بوون لێیان وپەیوەست بوون بە ماهیەتیان، چونکە واقیع پەیوەستە بەکۆمەڵێك هۆکارەوە و ئەوانیش بەربەستن لەبەردەم گەیشتن پێیان و خەونیش رێکخستن و ئامادەکردنەکەی (لە هەڵبژاردن ودەسەلات) ی مرۆڤا نیە، بۆیە خەیاڵ دەبێتە ئەو فریاد ڕەسەی کە ئیتر دەتوانیّ مەرامەکان دەستەبەر بکات ، خەیاڵ لێکردنێك کە ببێتە هۆکاری باشتر ناسین و زیاترکردنی ئیمان بەشتەکان لە دڵەکاندا بەشێوازێك دەکرێت کە لەسەرەتاوە تەکان درابێت بایەخی ناشایستەی

(جیهانی بینراو و هەست پێ کراو) لە دڵ ودەروونا کەمکرابێتەوە و هەرچی (أسماء و أحداث و أشياء = ناوەکان وشتەکان وڕووداوەکان) هەیە (وجود و حضور =هەبوون و ئامادەبوون) ی ناپێویستیان لە یادەوەریدا نەمابێ، چونکە ئاشکرایە کە خەون کاتێك هەیە و نمایشەکەی بۆ خاوەنەکەی پەیدا دەبێت کە لەڕێگای نوستن و داخستنی چاوەکانەوە (عالم الشهادة =جیهانی دیارو بینراو) لەزەین و هۆش و بیردا بکوژێنرێتەوە، دەی ئەمە هەر کاتێك توانرا لە ئاگاییدا بایەخ و بینین وحضور و وجوودی عالەمی شەهادە لەزەین و هۆش و بیردا بکوژێنرێتەوە، تا ئاستی گونجاو، لەبەرامبەریشدا خواگیان وحەزرەت گیان و پەیام وفەرمایشتەکان قەبارە و ئامادەبوونیان گەورە و زیادبکرێت و هەموو بەش و پارچەکان و بوونی مرۆڤ داگیر بکاو دابپۆشێ : ئەو دەمە لەئاگاییشدا زیندە خەون و بینین و نمایش پەیدا دەبن و پەیامەکان بەهۆکاری ئەوان و لەڕێگای ئەوانەوە دەگەنە دەست و دڵ و دیدەی خاوەنەکانیان. دەگەڕێینەوە سەر مەبەستی ئەو ڕستەیەی کە گوترا (چۆن لەڕێگای خەیاڵ کردنەوە ئیمان بەشتەکان لەدڵەکان زیادبکات و پەیامەکان بگەنە دەست ودڵ ودیدەی خاوەنەکانیان ؟) بەپێی ئەو پێناسەیەی لەسەرەوە کرا: بۆ ئەوەی (بە نموونە) ناسین و

ئیمانمان دەربارەی پێغەمبەر (سەلامی خودای لەسەر بێت) زیاترو راستەقینەتر بێت دەبێ خەیاڵ لە دانە دانەی رۆژگار و رووداوەکانی ژیان و تەمەنی موبارەکی حەزرەت گیان بکەین، هەر لەسەرەتای لەدایك بوونیەوە تا رۆژی نەقل بوونی موبارەکی بۆ جیهانی بەرزەخ، ئەمەش بەوە دەکرێت کە خەیاڵ و هەست و نەست و تەواوی پێکهات و ذەرراتی وجوودمان پەیوەست بکەین بە رووداوەکان و بچینە ناو (زەمان ومەکانی) دانە دانەی ژیانی رۆژانەی موبارەکی، (واتە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ دایکمان (ئامینەی کچی وەهەب ) دڵخۆش و شادە مەرگ بین بەهاتنە دونیای ئەو رۆشنایی دڵ و دینە و ئەو سەرچاوەی خۆشبەختیە و ئەو فەخری عالەم و(رحمة للعالمین) ە، پاشان لەگەڵ دایکمان (حلیمة السعدیة) هەنگاو بە هەنگاو لەبیابانەوە بێین بۆ شاری مەککە بەو نیازەی ئەو دایکەمان (محمد گیانی) منداڵی شیرەخۆر لەگەڵ خۆی بباتەوە بۆ ناو نەوەی سەعد، بەهێمنی سەیری ئەم دیمەن و رووداوانە بکەین و بزانین : کە ئەمساڵە ساڵی گرانی و قات وقڕی بوو، دایکمان حەلیمە لەگەڵ(حاریث)ی مێردی و لەگەڵ عەبدوڵای شیرەخۆرەی خۆیان هاتنە ناو شاری مەککە بەگوێ درێژێك و وشترێکی پیر کە دڵۆپێك شیر لەگوانیا نەبوو، سەرانسەری رێگا ئەو ژن ومێردە

چاوەکانیان نەدەچووە خەو، چونکە منداڵەکەیان لەبرسان دا تا بەیانی هەر دەگریا، نە دایکی دڵۆپێك شیری تێدا بوو، نە وشترەکەش . حەلیمە سوێندی دەخوارد و دەیووت هەموو ئافرەتەکان پێغەمبەری خوایان (سەلامی خوای لەسەربێت) نیشاندراوە، بەڵام کە پێیان دەوترا یەتیمە و باوکی نەماوە، روویان لیّ وەردەگێرا، چونکە ئەوان بۆیە ئەو منداڵانەیان دەبردە لادیّ و بەخێویان دەکرد تا باوکی مناڵەکە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکات، ژنەکان هەموو مناڵەکانی مەککەیان هەڵگرت و جگە لەحەلیمە هیچ ژنێك نەما مناڵی دەستنەکەوێت، جگە لە (موحەمەد گیانیش) لەمەککەدا منداڵێك نەما تا حەلیمە هەڵی بگرێت و لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ بیابان و بەخێوی بکات، دایە حەلیمە دڵۆپێك شیری لانەبوو بیداتە منداڵە شیرەخۆرەکەی و ئەویش لەبرسانا شەو تابەیان هەر دەگریاو دەکرووزایەوە، لەهەمان کات ئافرەتە هاورێکانی بەدڵی شادی خۆیان منداڵی دەوڵەمەندیان دەستکەوتبوو، ئەمیش هەردوو دەستەکانی خاڵیە و، جگە لە (موحمەد گیانی) بیّ باوکیش منداڵی تر نەماوە، ئیتر نەیدەزانی پەروەردگار خێری بۆ ئەو گلداوەتەوە، نەیدەزانی پەروەردگار بەرەکەتی ئاسمان و زەوی بۆ ئەو هەڵگرتووە ... حەلیمە کەمەند کێش بوو، هێزێك

رای دەکێشا، هێزی تەماعیش نەبوو، چونکە بەرژەوەندیەکی دونیایی لەو مندالە بیّ باوکە چاوەڕوان نەدەکرا، رۆیشت بۆ مالّی ئامینە و، تەقەی دا لەدەرگا و چووە ژوورەوە بۆ خزمەتی ئازیز و نەشیدەزانی ئەمە ئازیزترین مەخلوقی سەر رووی زەوی و ئاسمانەکانە، بینی موحەمەد گیان خەوتووە و ناوچاوی دەدرەوشێتەوە، دلّی نەهات خەبەری بکاتەوە و بەلەسەرخۆیی و بەهێمنی، بەوپەڕی شەفەقەتەوە لێی چووە پێش و دایکیشی تەماشای دەکرد، دەستی خستە سەر سنگی ئازیز و ئەویش زەردەخەنەیەکی مەلەکوتیی بۆ کرد و چاوە جوانەکانی کردەوە تا سەیری حەلیمە بکات، نوورێك لەهەردوو چاوە جوانەکانی هاتە دەرەوەو بۆ تا ئاسمان بەرزبوویەوە و حەلیمە ودایکیشی سەیریان دەکرد ...حەلیمە ماچێکی ناوچاوانی کردو مەمکی راستی خستە ناو دەمی موبارەکیەوە و خێرا مەمکەکانی پڕ لەشیر بوون و خۆشەویستمان لێی خواردەوە، پاشان مەمکی چەپیشی خستە بەردەمی بەلاّم دەمی موبارەکی بۆ نەبرد، چونکە خودای گەورە خستبوویە دلّیەوە کە ئەو لەو شیرە هاوبەشی هەیە و نابیّ بەشەکەی ئەو بخوات . حەلیمە: (گیان ودلّمانی) هەلّگرت و هێنایەوە بۆ شوێنی بارخستنیان، لەوێش شیری پێدا و لەلاکەی تریش شیری دەرخواردی منالّە بچوکەکەی خۆیان

دا و تیر لێی خەوت کە تا ئەو دەمە لەبرسان خەوی لەخۆی وئەوانیش تاراندبوو . حاریثی مێردی حەلیمە چووە لای وشترەکە کە لەوەوپێش گوانەکانی ووشکیان کردبوو، بینی وا گوانەکانی پڕپڕن لەشیر، لەشیرەکەی هێناو خۆی و حەلیمە تیر تیریان لێخواردەوە و ئەو شەوە خۆشیان و منالەکەشیان تیر لێی خەوتن. بەیانی بەرەو ناوچەکەی خۆیان گەڕانەوە، لەرێگادا وشترەکە و گوێدرێژەکە تەکانی سەیریان تێکەوتبوو، هاورێکانیان پێیان نەدەگەیشتن، بەگەیشتنیشیان بۆ هەوارگەی بەنی سەعد خواگیان بەهۆی خۆشەویستەوە فەڕ وبەرەکەتی رژاند بەسەر ئەو ناوچەیەدا و ماڵ و خانەوادەی حەلیمە وحاریث پر لەخێرو بەرەکەت بوو )...پاش تەواو بوونی ئەم مەشهەدانە بچین حازری تازیە نامەی دایکی جەرگسوزی ببین و بچینە ناو ناخ و دڵ و دەروونی برینداری و لەو حەسرەت و خەم و ئازارانە حاڵیی ببین کە منالێکی شەش ساڵان لەهەتیو کەوتنیا (بێ دایك و باوك و خوشك و برا) ناخی خەم باران دەکەن، پاشان لەگەڵیا ببینە شوانێکی بچکۆلەو بەدەم تەماشای مەڕومالاتەوە بەقووڵی هەست لەبیرکردنەوەکانی رابگرین و سەرنجی وردی رەفتارە جوان وگوفتارە شیرینەکانی بدەین، پاشان لەگەڵی هەنگاو هەڵگرین و گوێ لە دانپیانانی ئەو بەردە

خۆشبەختە بگرین کە بە ئاشکرا پێی دەفەرموو: (السلام علیك یا رسول الله)، پاشان لەگەڵ ئەو کاروانە سەفەر کەین کە بەرەو شام کەوتە رێ وخۆشەویستیشمان لەگەڵ ئەبو طالیبی مامەی لەگەڵیانا بوو، سەیرکەین چۆن (بوحەیرای راهیب) تووشی دڵمەستی وحەیران بوون دەبێ، وەختێ دەبینێ هەور سێبەری بۆ دەکاو دار و بەردو درەختیش دەچن بە کڕنووشا لەخۆشی ئەوەی ئەم سەروەرە بەسەریانا و بەلایانا تێپەر دەبێ و، بۆی دەبن بە هەوارگە و سابات، پاشان سەرنجی تەواوی خەڵکی مەککە بدەین کە چۆن ئەمانەت و شت و مەکە بەنرخەکانیان لەلای ئەو دادەنا و بە (صادق الامین = راستگۆی دەستپاك) پێناسەیان دەکرد، پاشان لەگەڵیا بچینە ئەشکەوتی (حراء= حیرا ) و چەند شەو و رۆژ وحەفتە و مانگ لەخزمەتیا بمێنینەوە و هەست (لە بیرکردنەوە قووڵەکانی لە بەدیهێنەری گەردوون و تەواوی دروستکراوان و رێساو دەستووره جوانەکانی) رابگرین و لەگەڵ ئەودا رۆح وناخ و دڵ و دەروون و شەپۆڵە مەعنەوییە غەیبیە ئەمریە ئیلاهیەکان هەڵمژین و سینە و هەست و نەست و تەواوی خانەکانی بوونمان پڕاو پڕ بکەین لە حەقیقەتی ئیلاهی .... لە سووچێکەوە تەماشای دابەزینی حەزرەتی جوبرەئیلی مەلائیکەت بکەین کە بەدەم

گوشینی باوەشینی حەزرەت گیانەوە ( إقرأ = بخوێنە = سەرنج بدە =بیربکەوە = قووڵ بەوە = رامێنە) ی لیٚ داوا دەکات و بەشێك لەسورەتی ( إقرأ )ی پیٚ خەڵات دەکات .. پاشان لەگەڵی بەو هەموو سەرسوڕمانیەوە بگەڕێینەوە لای دایکمان (خەدیجە خاتوون) وگویٚ بیستی رستە و پێناسە بەهادارەکانی ببین کە بۆ دڵدانەوە پێی دەفەرموو : هیچ خەم مەخۆ و هیچیش مەترسە، تۆ هەرگیز لێت تێك نەچووە و تووشی هیچ نەخۆشی و ناخۆشیەکیش نەهاتووی و نایەیت چونکە تۆ : (سیلەی رەحم بەجیٚ دێنی و، یارمەتی لاواز دەدەیت و دەستگرۆیی کەم دەسەڵاتان دەکەیت و نانی میوان دەدەیت و بەهانای لێقەوماوان دێیت و راستی دەڵێیت و ئەمانەت دەپارێزی ....) پاشان لەگەڵ هەردوو ئەم نوور وڕەحمەت و بەرەکەتە بچینە لای ئامۆزای دایکمان (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) و گویٚ لەدڵدانەوە و پێناسە راستەقینەکانی بگرین کە پێی دەفەرمووێ (ئەمەی بۆ تۆ هاتووە هەمان ئەو نامووسەیە کە بۆ تەواوی پێغەمبەران هاتووە، ئەوەش کە هێناویەتی هەمان ئەو رەوانە کراوەیە کە بۆ لای (موسا) پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەربێت هاتبوو، هیچ مەترسە وتۆ کراویت بە پێغەمبەر و خۆزیا گەنج دەبووم بۆ بەرگریکردن لەخۆت وپەیامەکەت

ئەو کاتەی کە گەلەکەت دەریان دەکردی ...) پاشان لەگەڵی روو بە کەعبە نویّژ بکەین و بەشمان لەو ئازار و ئەشکەنجانە بەرکەویّ کە دەیاندا بەسەریدا، پاشان لەگەڵ (خۆی و زەید )دا بچین بۆ طائیف و هەموو ئەو ئازار و ئیّشانە بچیّژین کە بەهۆی بەردەکانەوە بۆیان دەهاویّشتران لەلایەن گەلی طائیفەوە بەفەرمانی گەورەکانیان، لەگەڵیا لەبن درەختەکان پشوویەکی خەمبارانە بدەین و قاچە موبارەکە زامدارەکانی تەداوی بکەین و تەماشای ئەو هەڵویّستە پیّغەمبەرانە و مەردانە و بەخشندانە بکەین و گویّ لەو موناجات و دڵ هەڵقرچانانە رابگرین کە لەدەمی موبارەکی دەهاتنە دەریّ وەختیّ مەلائیکەت پیّی دەفەرموون خودا سەلامت لیّ دەکات و پیّت دەفەرمویّ ئەگەر حەزدەکات با ئەو دوو شاخە بدریّ بەسەر سەری ئەم گەلە و لەناوببریّن، کەچی ئەویش لە وەڵامدا دەفەرمویّ نەخیّر حەزناکەم و ، بەکوڵ رووی دڵی دەکاتە خوا گیان ویێی دەفەرمویّ : (بۆ لای تۆ بەرزدەکەمەوە سکاڵای بیّ تواناییم وکەم بایەخیم بەلای خەڵکانەوە، ئەگەر تۆ لیّم زویر نەبی من هیچ باکم نیە ... ) پاشان لەگەڵیانا بچینە (شیعابی ئەبو طالب) و ئەو هەموو حەسرەت و نەخۆشی و ناخۆشیانەیان لەگەڵ بچیّژین و ئەو هەموو برسیەتی وتیّنویّتی ودابڕینی سیلەی ڕەحمەیان

هەست پیٚ بکەین و لەهەمووان جەرگبڕتر ئامادەی جەنازەی گەورەی ئافرەتە ئیماندارەکان (دایکمان خەدیجە) بین کە لەدوای ئەو هەموو سەروەت و سامانەی کە هەیبوو و بەخشی لەپیٚناوی حەزرەت گیانی و ئیسلامەتیا کەچی لەویٚداو لەبرسانا فەوتی موبارەك دەکات ... پاشان لەگەڵیٚدا سەفەری (ئیسرا ومیعراج) بکەین و سەرەتا بچینە مزگەوتی (أقصی) و شاهیٚدی بینینی کەرنەڤاڵی سەرجەمی پیٚغەمبەران بین لەو پیٚشوازییە شکۆمەندانەی کە لیٚی دەکەن و لەگەڵیانا ریز ببەستین بۆ نویٚژ وگویٚ لەدەنگی زوڵاڵ و مەلەکوتیانەی پیٚغەمبەر بگرین لەخویٚندنی قورئانا ، پاشان لەگەڵیا سەرکەوین بۆ ئاسمانەکان و تەواوی نهیٚنی وئایەتە گەورەکانی ئاسمانی لەگەڵ موشاهەدە بکەین و ئاسمان بە ئاسمان سەردانی پیٚغەمبەرە بەرِیٚزەکانی وەك ( ئادەم و یحیی و عیسی و یوسف و ئیدریس هارون و موسی و إبراهیم ) بکەین و گفتوگۆی شیرینیان گویٚ لیٚبگرین ... پاشان لەگەڵ خۆی وئیمام ئەبوبەکری صددیقا کۆچی موبارەك بکەین بەرەو مەدینە و لەرِیٚگا لادەینە ناو ئەشکەوتی ( ثور ) وببینین چۆن ئەبوبەکر گیان بەجلەکانی کون وکەلەبەرەکانی ناو ئەشکەوتەکە دەگریٚت وئیٚمەش لەسووچیٚکا لەدواوەی ئەوان دانیشین و گویٚ لەم گفتوگۆ شیرینەیان بگرین وەختیٚ

لەهاتنی سەرانی بێ باوەڕی قورەیشا بۆ بەردەم ئەشکەوتەکە(صددیقی ئەتقا ) بە حەزرەت دەفەرموێ : واللە ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تەماشای خوارەوە و قاچی خۆیان بکەن ئێمە دەبینن ، حەزرەت گیانیش بەئەوپەڕی هێمنی و متمانە بوونی بە خواگیانی خۆیەوە، بەئەوپەڕی دڵنەوایی کردنی هاوڕێ گیانی بە گیانیەکەی لە وەڵاما پێی دەفەرمووێتەوە: (ئەی ئەبو بەکر گومانت چۆنە بە دووانێك کە سێهەمینیان خودا بێ)

﴿ إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة:40)

پاشان بچینە مەدینەی منەوەرە و بەر لە هەرشت لەگەڵ هاوەڵ و یاریدەدەرەکانی خەریکی دروست کردنی مزگەوت بین بۆ پەرستشەکان، پاشان وردە وردە سەرنجی ئەو برایەتی پێ کردنەی نێوان (مهاجرین و أنصار = کۆچکەران و یاریدەدەران) بدەین کە پێغەمبەر دەیکات لەنێوانیان وگوێ لە گفتوگۆی نێوان ئەو دووهاوەڵە بەڕێزە

(سەعدی کوری رەبیع وعەبدولرەحمانی کوری عەوف) بگرین کە حەزرەت کردبوونیە برا وەختێ (سەعد)بە(عەبدولرەحمان ) دەفەرموێ : ئیدی لەمەولا من وتۆ براین و هەرچیەکم هەیە لەماڵ وسەروەت و سامانەکەم نیوەی بۆ تۆبێ و دوو خێزانیشم هەیە بزانە کامیانت پێ گونجاوە بۆتی تەڵاق دەدەم و پاشان بیکە بە هاوسەری ژیانی خۆت، (عەبدولرەحمانیش) لە وەڵامی ئەو هەڵوێستە ئیماندارانە و جوامێرانە و مێژوو هەژێنەرە دا پێی دەفەرمووێ : خودا بەرەکەت بخاتە ماڵ و خێزانتەوە، لەجیاتی ئەوە تۆ بازاڕی خۆتانم پێ نیشاندە تا دەسکەم بە کەسابەت ..) پاشان لەگەڵ خۆی و هاوەڵەبەڕێزەکانی بەشداری شەڕی بەدر و تەواوی رووداوەکانی ناوی بکەین و شایەت حاڵی دابەزینی مەلائیکەتانی خودا بین و پاشان شەڕی ئوحود و تەواوی رووداوە جەرگبڕەکانی و پاشان تەواوی شەڕەکانی تر دانە دانە لەناویانا گوزەر بکەین و ڕەفتار و گوفتارە شیرینەکانی حەزرەت سەرنج بدەین، پاشان بەشداری صولحی حودەیبیەی لەگەڵ بکەین و ورد بڕوانینە خاڵ و بەندەکانی صولحەکە و وردتریش بڕوانینە ناخ و دەروونی هاوەڵە بەڕێزەکانی، پاشان لەگەڵیا فەتحی مەککە بکەین و لەلای ڕاستیا ولە چوونە ناویا گوێ لەو فەرمایشتە پڕ لەڕەحمەتە بگرین وەختێ یەك لە

یاوەرە بەرێزەکانی بە کافرەکان دەڵێ (الیوم یوم الملحمة) وحەزرەتیش دەفەرمووێ نەخێر (الیوم یوم المرحمة)، هەروەها لەو هەڵوێستە جوامێرانە رابمێنین و ئەو فەرمایشتە بەهادارە گوێ لێبگرین دەربارەی سەرسەختترین دوژمنی تا ئەو ساتەی ئەو ئایینە کە ئەبوسوفیان بوو بەر لەموسڵمان بوونی فەرمووی : هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان سەروسامانی سەلامەت وئەمینە ..پاشان نمایشی دارعەصاکەی بکەین کە دەینا بەچاوی بتەکانی دەور و بەری کەعبە و دەیفەرموو : ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ ( الاسراء: 81)، پاشان بە هێمنی بە دیار ئەم کۆکردنەوەی خەڵکانی مەککە لە کەعبەدا دابنیشین کە حەزرەت پێیانی فەرموو : (گومانتان وایە کە چیتان دەرحەق بکەم ؟ ئەوانیش لەوەڵامیا وتیان : برایەکی بەخشندەی پایە بەرز و کوڕی برایەکی بەخشندەی پایە بەرزمانی) ئەویش پێی فەرموون : بڕۆن ئیتر ئێوە هەمووتان ئازادن ... پاشان حازری رۆژگاری نەخۆش کەوتن و فەوتی موبارەکی ببین و بەدیار گریان و هەنسکی قووڵی دڵ وگیانی هاوەڵە بەرێز و دڵسۆزەکانی : ئێمەش بەکوڵی دڵ بگریین ...

ئیدی ئەم خەیاڵ لێکردنە بۆ تەواوی ژیاننامەی حەزرەت گیان و دواییش بۆ تەواوی باس و بەسەرهات و ژیاننامەی پێغەمبەرانی تر بکەین و پاشان مەلائیکەتانی خواو بەهەشت و دۆزەخ و نهێنیەکانی ئاسمانەکان هەر بەهەمان شێوەن گەر بمانەوێ ناسین و ئیمانی دڵ و دەروونیمان دەربارەیان زیاتر و پتەوتر ببێت ... ئیدی بەر لەهەر شت بە فەضل و بەخششی خودا و پاشان بە گەیشتن بەم پلە و ئاستە لەخەیاڵکردن و تێکەڵبوون بە ژیان نامە و باس و بەسەرهاتی حەزرەت گیان و تەواوی مەلائیکەتان و بەهەشت ودۆزەخ و ... هتد ... شتێکی سەیر و سەمەرەی تر خەڵات دەکرێ و سەرهەڵدەدا : ئەویش ئەوەیە کە کەسایەتیەکان و رووداوەکان (بە ئیذنی خوا) وردە وردە (شێوە و روخسار = دەنگ و رەنگی مەعنەوی) پەیدا دەکەن، بەواتا وەختێك بەو قووڵیە (بە نموونە) خەیاڵ لەحەزرەت دەکەین و تێکەڵ بە ناخ ودڵ و گیانمان دەبێت و تەواوی هەست و نەست و خەیاڵمان داگیر دەکات : ئەو دەمە لەکاتی پێویست بوون و لەساتە وەختی خەیاڵ لێکردنی قووڵی ڕاستەقینەدا حەزرەت گیان (شێوە ورووخسار = دەنگ ورەنگی) لەطیفی مەعنەوی پەیدا دەکات لەبەردەم بینایی تەندروست وسۆمای دڵی خەیاڵگردا، ئیتر ئەوەی پێویست بکات حەزرەت لە چەشنی پەیام

پێی رادەگەیەنیٚ ودڵنەوایی دەکات و ئاراستەی دروستی بۆ دیاریی دەکات .. دەبیٚ ئەوەمان لەبیرنەچیٚ ئەم پەیدا بوونەی حەزرەت گیان هەرجارەی بەهۆی یەکێك لەم چۆنیەتیانەی خوارەوە دەبێت و دەکەوێتە بەر بینایی :

**1- لەڕێگەی (تمثل = تەمەثثول) کردنی مەلائیکەتانەوە لەسەر شێوە و رووخساری حەزرەت گیان : ئەمەش** بەشێوەیەکە کە خودای گەورە ئیذن و فەرمان بە یەکێك لە مەلائیکەتەکان دەدات بچێتە سەر شێوە و رووخساری حەرزەت و ئەو پەیامەی کە پێویستە بیگەینیٚ، دەیگەیەنێتە دەست ودڵ و دیدەی کەسە ئیماندار و خەیاڵگرەکە، ئیدی ئەو لە دەروون و دیدەی تایبەتی خۆیا حەزرەتی بینیوە و پەیامە تایبەتیەکەی لە ئەو وەرگرتووە ... دیارە ئەو تەمەثثول کردنی مەلائیکەتەش لەسەر شێوە و رووخساری بنیادەم شتێکی ئاساییە و لەقورئان ولەفەرمایشتەکانی حەزرەتیشا نموونەیان زۆرە، لەقورئانا بۆ حەزرەتی (مەریەم = گەورەی ئافرەتانی ئیماندار) وەختیٚ کە پلە و پایەی ئیمانیی تا دوا لوتکە بەرز دەبێتەوە و کاتی ئەوە دێت کە خوای گەورە هەم تاقی بکاتەوە وهەم گەورەترین موعجیزە

بەهۆی ئەوەوە بەرپا بکات بۆ مرۆڤایەتی (کە هێنانە وجوودی منداڵێکە بەناوی (عیسای کوری مەریەم) ) ئیدی لەو دەمە خودای گەورە پەیوەندی پێوە دەکات و لەڕێگای یەکێك لەمەلائیکەتە بەڕێزەکانی خۆیەوە (کە تەمەتثول دەکاتە سەر بەشەرێکی رێك وپێك) ئەم هەواڵی منداڵ بەخشینە بێ باوکەی پێ رادەگەیەنێ . خودای گەورە ئەم بەسەرهاتەی لەقورئانا تۆمار کردووە و دەفەرمووێ :

﴿ وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ (42) يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴾ (آل عمران: 42-43) ﴿ إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴾ (آل عمران: 45)

هەروەها: ﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انْتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا (16) فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا (17) قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا (18) قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا (19) قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا (20) قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً

لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا﴾ امريم: 21)، یان ئەو مەلائیکەتە بەڕێزانەی لەسەر شێوەو ڕووخساری چەند پیاوێك بە میوانی هاتنە خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیم و پاشان چوونە خزمەتی حەزرەتی (لوط) یش : { وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ (69) فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ (70) وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ (71) قَالَتْ يَا وَيْلَتَا أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ (72) قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ (73) فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ (74) إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ (75) يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ (76) وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ }اهود: 77)،

لەفەرمایشتەکانی حەزرەتیشدا هەموومان ئەو فەرموودەیەمان بیستووە کەئیمامی بوخاری دەیگێڕێتەوە بۆمان کاتێ کە جوبریل لەشێوە و ڕووخساری پیاوێکدا دێتە لای و بەدیار هاوەڵە بەڕێزەکانیەوە

چەند پرسیارێك ئاراستەی حەزرەت دەكات و ئەویش دانە دانە وەڵامیان دەداتەوە :

4404 – { حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ عَنْ جَرِيرٍ عَنْ أَبِي حَيَّانَ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ يَمْشِي فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِيمَانُ قَالَ الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَلِقَائِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِسْلَامُ قَالَ الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ وَتَصُومَ رَمَضَانَ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِحْسَانُ قَالَ الْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ قَالَ مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتْ الْمَرْأَةُ رَبَّتَهَا فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا وَإِذَا كَانَ الْحُفَاةُ الْعُرَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ { إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ }

ثُمَّ انْصَرَفَ الرَّجُلُ فَقَالَ رُدُّوا عَلَيَّ فَأَخَذُوا لِيَرُدُّوا فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا فَقَالَ هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ }..

هەروەها هەمووشمان ئەم فەرموودەیەی حەزرەتمان بیستووە کە باسی کەسێکمان بۆ دەکات کە دەیەوێ بچێتە سەردانی برادەرێکی خۆی وخودای گەورە مەلائیکەتێك لەسەر شێوەی مرۆڤێك دەنێرێتە سەر رێگای وپێی دەڵێت بۆچی دەچیتە سەردانی ئەو برادەرەت (خزمایەتی ومامەڵە و بەرژەوەندیەك هەیە لەنێوانتان ؟ ئەویش دەڵێ نەخێر تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودا دەچمە سەردانی، ئیدی مەلائیکەتەکەش پێی دەفەرمووێت مژدەت لێ بێت من مەلائیکەتی خودام و خوداش لێت خۆش دەبێت بەهۆی ئەم کردارەتەوە.) هەمووشمان لەژیاننامەی حەزرەتا ئەوەمان بیستووە کە زۆرجار مەلائیکەت لەسەر شێوەی یەکێك لەهاوەڵە بەرێزەکانی دەهاتنە خزمەتی هەم بۆ هێنانی سرووش وهەم بۆ هاوکاری وبەشداری کردنیان لەشەڕ لەگەڵیدا. (دوحیەی کەلەبی) ش یەکێکی ئەو هاوەڵانە بوو کە مەلائیکەت دەهاتنە سەر شێوەو رووخساری دەی کەواتە مادام لەرۆژگاری کۆن ونوێدا ئەم شتە رووی دابێ و مەلائیکەتان هاتبنە سەر شێوە و رووخساری مرۆڤ شتێکی ئاساییشە بێنە سەر شێوە و ڕووخساری پێغەمبەریشمان و پەیامی دڵ و گیانی پێغەمبەر بگەیەنن بە ئەهلی خۆی، ئەوەش کە حەزرەت

دەفەرمووێ شەیتانەکان ناتوانن خۆیان بخەنە سەر شێوەو رووخساری من ئەوا ئاشکرایە کە قسە لەسەر شەیتانەکانە نەك مەلائیکەت .

2- لەلای رێبوارانی رێی مەعنەوی و ئەهلی دڵ وکەشف ئەمە رۆشنبوتەوە و سەلمێنراوە کە هەموو مرۆڤێکی ئیماندار بەلانی کەم (صورە مثال) ێکی هەیە، ئەگەر ئاستی ئیمانی و نزیکی لەخواو مەحەبەتی بۆ حەزرەت بگەنە ئاست و پلەی بەرزی داواکراو ئەوا ئاشنایەتی لەگەڵ (صورە مثال =هاوشێوەکەی خۆی) پەیدا دەکات و هەرکات خودا رێ بدات و پێویست بکات رۆحی ئەو: {جوولە و بەرپرسیارێتی و کار و نواندنی هەڵوێست} لە هاوشێوەکەیدا پەیدا دەکات و لە(شوێنگەلی) جودا لە (صورە حقیقی =بوونی راستەقینە) ی خۆی : گوفتار و رەفتار دەکات ..دیارە کە پێغەمبەریش بەرزترین و بەهێزترین ترین و کامل ترین (صورە مثال = هاوشێوەی) هەیە و دەکرێت وسانایە کە لەیەك کاتدا هەموو خەڵکی سەر زەوی لەخەوندا ببینن و لەیەك کات ولە چەندین شوێنی جیاوازیشدا (هەموو ئیماندارانی گەورەی تایبەت) لە واقیع دا ببینن و پەیامی پێویست لەدەست و دڵ ودیدە و زاری موبارەکی وەربگرن ،کەئەمە

بەخششێکە خەلاتی مرۆڤ کراوەو توانستێکە لە(ڕۆح) دا وجوودی حەقیقی هەیە چونکە هی خوا خۆیەتی..ئێستاش فەرموو با پێکەوە:

یەکەم- سەرنجێکی ئەم ئایەتە بدەین { وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آَدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ «الأعراف:172» بەواتا هەموو مرۆڤایەتی دانێیان نا لەبەردەمی خوادا و بوون بەشاهێدیش بەسەر نەفسی خۆیانەوە کە (ألله) پەروەردگاریانە، دەی لەکاتێکا کەهێشتا جگە لە(ئادەم سەلامی خوای لەسەر بێت) هیچ مرۆڤێك بەرۆح و جەستەوە نەهێنراوەتە بوون.

دووەم- هەروەها سەرنجی ئەم فەرموودەیەی حەزرەت بدەین کە ماناکەی نزیکە لەناوەرۆکی ئایەتەکەی سەرەوە کە بۆ شەرحی ئەم ئایەتە پرسیاری لیٚ کراوە:« وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا «الأحزاب:7» : (کەباس لە وەرگرتنی پەیمانی پێغەمبەرایەتی دەکات لەلایەن خوداوە لە حەزرەت لەکاتێکا هێشتا ئادەمی یەکەم مرۆڤی دروستکراوی خوا لەنێوانی رۆح و جەستەدا بووە: {حَدَّثَنَا يَحْيَى بن كَثِيرٍ أَبُو النَّضْرِ، عَنْ

جُوَيْبِرٍ، عَنِ الضَّحَّاكِ بن مُزَاحِمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَتَى أُخِذَ مِيثَاقُكَ؟ قَالَ:وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالْجَسَدِ.} «المعجم الكبير للطبراني»

سێ یەم- هەروەها سەرنجی ئەم فەرموودەیەی حەزرەت بدەین وەختێ کۆمەڵێك لەهاوەڵە بەڕێزەکانی حەزیان کرد بەشداری شەڕی ( تەبووك ) ی لەگەڵدا بکەن، بەڵام هیچ سەروەت و سەرمایەکیان نەبوو تا ئەسپ و شیر و تیر و پێویستیەکانی جەنگی پێ بکڕن، ناچار لەبەر ئەم عوزرەیان نەیان توانی بەشداری شەڕەکە بکەن ومانەوە لە ( مەدینە )دا، کەچی حەزرەت لەڕێگادا بەهاوەڵەکانی فەرموو ئێمە هیچ دۆڵ وشیوێکمان نەبڕیوە ئیللا کۆمەڵێك هەن لەگەڵمانا بوون ئەگەرچی عوزر لەماڵەکانیانی بەندکردوون،{بەواتا لەیەك کاتا لە مەدینەش بوون و لەگەڵ حەزرەتیش وجوودیان هەبووە} کەئەمەش صدق وصەفای دڵی ئەوان وعەزم و نییەتی ڕاستەقینەیان بووە جەستەی پەیداکردووە لەشێوە و ڕووخساری خۆیاندا، خودای گەورەش یادەوەری ئەم هاوەڵە دڵگەش و گەرم و چاو بەفرمێسکانەی بەم شێوەیە ئاماژە پێداوە لە قورئاندا :

﴿وَلَا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوْا وَأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنْفِقُونَ .. ﴾ «التوبة:92»

چوارەم- سەرنجی ئەم فەرموودەیەش بدەین کە حەزرەت لە بینینی دیمەنێکی بەهەشتا بە ( بیلال ی حەبەشی ) دەفەرموێ:{ئەی بیلال گوێم لە خشپەی نەعلەکانت بوو لە بەهەشتا، بە چ کردارێك بەوە گەیشتی؟}ئەویش لە وەلامیا دەفەرموێ ئەوەی لەهەموو کردارەکان زیاتر ئومێدم پێی هەبێ ئەوەیە کە لە دوای هەڵگرتنی هەموو دەستنوێژێك چەند نوێژێك دەکەم لەو نوێژانەی کە خوا لەسەری نووسیوم «**1081** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ أَبِي حَيَّانَ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِبِلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ يَا بِلَالُ حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الْإِسْلَامِ فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ قَالَ مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طَهُورًا فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ دَفَّ نَعْلَيْكَ يَعْنِي تَحْرِيكَ{صحيح بخاري : 1081} ( بەواتا لەیەك کاتا هەم پێغەمبەری خواو هەم بیلالیش لە مەدینەش بوون و لە بەهەشتیش بوون) ..

3 - پەیدابوونی حەزرەت بە ڕۆحانیەتی خۆیەوە : ئاشکرایە کە خودا دەربارەی ئەوانەی کە لەپێناوی خۆیدا کوژراون دەفەرمووێ بەمردوویان حیساب مەکەن بەلای خۆتانەوە، چونکە ئەوانە زیندوون و لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوە رزق وروزی دەدرێن . ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾ آل عمران:169).دیارە ئەو زیندوویتیەش بە تەنها زیندوویتی مەعنەوییان نییە لەدڵ و یادی ئیمانداراندا، بەتەنها زیندوویتیشیان نییە لەدواروژ و لەبەهەشتا چونکە هەموو ئیمانداران کە دەچنە بەهەشت زیندوو دەمێننەوە تیاییدا نەك تەنها کوژراوانی ڕێی خودا، ئاشکرایە باسەکەش باسی پێدانی ڕزق و ڕۆزی یە لەلایەن خوداوە، بەڵکو زیندوێتیان زیندوێتی (حەقیقی =مەعنەوی) یانە و هەرکات پێویست بکات خودای گەورە ئیزن دەدات وەکو شکۆمەندی و ڕێزێك بۆیان ڕۆحیانیەتیان بەناو کەسانی تایبەتدا هامووشۆ بکاتەوە و ئاڵوگۆڕی ڕەفتار وگوفتار بکەن ... تێ خۆ پایە و پلەی (کوژراوانی ڕێی خودا) بەرز و باڵاتر نیە لە پێغەمبەران بە گشتی و لەپێغەمبەری خۆشمان بەتایبەتی، چ جای ئەوەی کە پێغەمبەرمان هەم پێغەمبەرە و هەم کوشتراوی ڕێی خوداشە، چونکە لەسەرە مەرگیا

دەیفەرموو : ( هەست دەکەم ئەو ژەهرەی لەو خواردنە دەرخواردم درا ئێستا وا ڕەگ وریشاڵەکانی دەروونم پارچە پارچە دەکات ) کەواتە ئەگەر کوژراوانی ڕێی خودا زیندوو بن ئەوا پێغەمبەران بە دڵنیاییەوە هەمیشە زیندوون وحەزرەتیش دەفەرمووێ (( خاك لەسەری حەرام کراوە لاشەی پێغەمبەران بڕزێنێ وبیانکاتەوە بە خۆڵ {1627 - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ سَوَّادٍ الْمِصْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلَالٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَيْمَنَ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ نُسَيٍّ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكْثِرُوا الصَّلَاةَ عَلَيَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَإِنَّهُ مَشْهُودٌ تَشْهَدُهُ الْمَلَائِكَةُ وَإِنَّ أَحَدًا لَنْ يُصَلِّيَ عَلَيَّ إِلَّا عُرِضَتْ عَلَيَّ صَلَاتُهُ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهَا قَالَ قُلْتُ وَبَعْدَ الْمَوْتِ قَالَ وَبَعْدَ الْمَوْتِ إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ فَنَبِيُّ اللَّهِ حَيٌّ يُرْزَقُ ( إبن ماجه ).

بۆ زیندوویێتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) دەتوانین سوود لە فەرموودەکانی (إسراء ومعراج) وەربگرین کە حەزرەت بەئاشکرا باسی زیندوویێتی و حضور و وجوودی هەموو پێغەمبەرانمان بۆدەکات لەو سەفەرە موبارەکەیدا، بۆ نموونە دەفەرمووێ (بەلای مووسای براما تێپەڕیم، بینیم وا لەناو گۆڕەکەیدا نوێژ دەکات)، پاشان

دەفەرموێ (هەرکە گەیشتمە بيت المقدس هەموو پێغەمبەران ئامادەبوون و پێش نوێژیم بۆیان کرد)، پاشان کە خوا بەرزی دەکاتەوە ئاسمانەکان لەوێشدا لەگەڵ چەندین پێغەمبەر گفتوگۆو چاو پێکەوتن دەکات ، ئەوانیش: ( ئادەم و یەحیا و عیسا و یوسف و ئیدریس و هاروون و مووسا و ئیبراهیم .. سەلامی خوایان لەسەربێت ) بەواتە حەزرەتی مووسای هەم لەناو گۆڕدا بينيوە و هەم لە بيت المقدس دا و هەم لە ئاسمانی شەشەم دا..

نسبەت بە زیندوویّتی و چاوپێکەوتنی خۆیشی دەتوانین سوود لەو فەرموودە شیرینەی خۆی وەربگرین کە ئیمامی بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە کە تیایدا حەزرەت دەفەرموێ ( من رآني في المنام فسيراني في اليقظة ) ئاشکرایە ماناکەی کە دەفەرموێ هەرکەس منی بینی یان من ببینێ لە خەوندا ئەوا بێ گومان لە ئایندەدا من دەبینێ لە ئاگاییدا. مەدەی ئەم فەرموودەیە نابێ تەنها بە ڕۆژی دوایی و ناو بەهەشت لێك بدرێتەوە چونکە ئەگەر وابوایە دەیفەرموو ( فسيراني في الجنه ) بەڵکو مەبەستی لەوەیە ئەگەر خەون بینەکە شایستە بێت و قۆناغە دەروونی و ئاستە بەرزەکانی ئیمان ببڕێت و مەحەبەتی بۆ حەزرەت تا ئاستی لە خۆ خۆشەویست تر چوو ئەوا وەك چۆن لە خەوندا

بینیویەتی ئاوهاش ڕۆژگارێك لە دونیا و لە ئاگاییدا دەیبینێ، جا چ لەڕێگای تەمەڤولی مەلائیکەتانەوە بێت لەسەر شێوە و ڕووخساری حەزرەت خۆی، یان هەر ڕۆحیانەتی موبارەکی خۆی دەبینێت لە جەستەیەکی لەطیفی خوا خەڵقندەی مەعنەویدا..

( من لەبۆ پێشوازی تۆی نازی زلەو ماقوولێ شکێن

کاولەیەکی انفرادیم هەن بێ ئاوەند و رەوەن )..

ئێمە هەمیشە ترسمان لە زیندووبونەوەی مردووە لە واقیعدا، بۆیە هەرکات گوێ بیستی زیندووبونەوەی مردوو ببین لە دونیادا بێ سێ و دوو رەتی دەکەینەوە و رازی نابین ئەم بابەتە بێتە ناو خانەی باوەڕ پێ بوونمانەوە، کەچی ئەگەر دەسەلاتەکە بۆ خودا بگێرینەوە و هێز و توانستی ئەویش بێنینەوە بەر یادەوەریمان و بیرمان بکەوێتەوە کە خودا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە و تواناداره ﴿إن الله على كل شيئ قدير ﴾ (البقرة:259) وهیچ شت ورووداوێك نیە بتوانێ خۆی لەبەردەم بەرپابوونی دا بگرێت ئەگەر خۆی بیەوێ : ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ (النحل:40) ئەوا ئاسانتر دەتوانین

ئیستیعابی بابەتەکە بکەین . مەگەر هەموومان موعجیزەی حەزرەتی عیسامان لەقورئانا نەخوێندوتەوە کە بەفەرمانی خودا مردووی زیندوو دەکردەوە بەبەرچاوی خەڵکانەوە؟: ﴿ إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ}المائدة110یان{إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ {45} وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ {46} قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاء إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ {47} وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ {48} وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِىءُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ

إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران:49)، خۆ ئەگەر بگوترێ ئەو مردووەی کە زیندووی دەکردەوە هەر تەنها بۆ چەند سات و کاتژمێرێك بوو پاشان دەمردەوە و نەدەهاتەوە ناو ژیان بەفەرمانی خودا و نەدەبۆوە تاکێکی ژیانلەبەر لەکۆمەڵگادا، ئەوا دەڵێین ئەگەر چی قورئان ئاماژە بەمردنەوەی کەسە زیندووەکە ناکاتەوە لەدوای ئەوەی بەفەرمانی خودا بەوتەی حەزرەتی عیسا زیندوو کراوەتەوە (چونکە مردنیش هەر شتێکە لەو شتانەی کە هیچ کەس لە دەسەڵاتی دانیە بە ئەنجامی بگەیەنێ لەسەر هیچ مەخلوقێکا مەگەر بەفەرمانی خودا)...

بەڵام بەهەر حاڵ ئەگەر وای دانێین کە ئەو مردووە پاش زیندووکرانەوەی نەهاتوتەوە ناو ژیان و ناکرێتە بەڵگەی زیندووبوونەوە و هاتنەوە ناو کۆمەڵگای (حەزەرتی محمد سەلامی خوای لەسەر بێت) . ئەوا خۆ هەموومان چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیممان لە یادە کە بەخوا گیان دەفەرمووێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِـي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقرة:260)، ئاشکرایە کە چوار باڵندەی هێناوەو لەدوای ئەوەی هەمووی پارچە پارچە کردوون وپاشان

هەر کۆمەڵە پارچەیەکی لەسەر چیایەك داناوەو پاشان بانگی کردوون و ئەوانیش بەفەرمانی خوا بوونەتەوە بە باڵندەکانی جاران وهاتوونەتەوە ناو ژیانی خۆیان و تەمەنیان بەردەوامی بووە ... خۆ ئەگەر بۆ ئەمەشیان بگوترێت ئەمانە مرۆڤ نەبوون و باڵندە بوون و باڵندەش پێوەر و پێوانەی لەسەر مرۆڤ پێ ناکرێت و نابێتە بەڵگە لە سەرهاتنەوەی حەزرەت گیان لەکاتی پێویست بۆ ناو ژیان و ناو کۆمەڵگا ... خۆ هەموومان چیرۆکی (عزیر =عوزەیر) پێغەمبەرمان زانیوە لە قورئانا کاتێ بەرێبوارییی بە سواری گوێ درێژێکەوە کە هەندێك خواردن و خواردنەوەشی لەگەڵ خۆی دا هەڵگرتبوو، بەلای ناوچەیەکی خاپووردا گوزەر دەکات و پرسیاری نسبەت بە زیندووبونەوەی خاکی ناوچەکە و خەڵکەکەی بۆ دروست دەبێت و دەڵێت هەموو ئەمانە دەبێ چۆن زیندوو بکرێنەوە: ئیدی خواگیانیش سەد ساڵ دەیمرێنێ و پاشان زیندووی دەکاتەوە و شایەت حاڵیی بینینی بنیات نانەوەی ئێسقان و پێوەلکانەوەی گۆشت بە ئێسقانەکانی گوێ درێژەکەیشی دەکات وبەبەرچاویەوە ئەویش زیندوو دەکاتەوە : ﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىَ يُحْيِـي هَـَذِهِ اللّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا

أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة:259) ... دەی خۆ ئەمە هیچ گومان و تەئویلێك هەڵناگرێت و پێغەمبەرێکە دوای سەد ساڵ تێپەڕین بەسەر مردنیا دەگەڕێتەوە ناو ژیان و ناو ماڵ و منداڵ و خانەوادەی و لەسەر گەیاندنی پەیامەکانی خوداش بەخەڵکان بەردەوام دەبێت، تا ئەو دەمەی جارێکی تریش خودای گەورە دەیمرێنێتەوە ...

لەفەرمایشتەکانی خۆشیا حەزرەت دەیفەرموو: ((کردەوکانتانم پیٚ نیشان دەدرێت، ئەگەر چاکەم تیایانا بینی سوپاسی خوا دەکەم، ئەگەر خراپە و سەرپێچی و تاوانیشم تێدا بینی داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەم)) خۆ دیارە ئەوەی کە شتی نیشان دەدرێت و دەبینی و دەبیستیٚ و گوفتار دەکات زیندووە نەك مردوو، هەروەها دەیفەرموو : ((هەرکاتێك یەکێك لە ئێوە سەلامم لیٚ بکات وبۆم بنێریٚ ئەوا خوای گەورە رۆحم بۆ دەنێرێتەوە تا وەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە:)- ﴿ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَوْفٍ حَدَّثَنَا الْمُقْرِئُ حَدَّثَنَا حَيْوَةُ عَنْ أَبِي صَخْرٍ حُمَيْدِ بْنِ زِيَادٍ عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُسَيْطٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلَّا رَدَّ اللَّهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ ﴾ (سنن أبو داود)

دەی ئەمە لەلایەك بە ئاشكرا باسی پێ بەخشینەوەی ڕۆح دەكات بۆ ئەو لاشە موبارەكەی كە خاك لەسەری حەڕام كراوە بیخوات و بەهۆیەوە بەجەستەو گیان زیندوو دەبێتەوە، لەلایەكی تریش ئەگەر حیسابی هەموو موسڵمانانی سەر گۆی زەوی بكەین وكاتی نوێژەكانیان وكاتی سەلامكردنیان و صەلاوات ناردنەكانیان حیساب بكەین ئەوا ساتێك لەشەو و ڕۆژدا نامێنێتەوە كە سەلام و صەلاوات دانێكی بۆ ڕەوانە نەكرێ، كەواتە ساتێك نامێنێ كە حەزرەت ڕۆحی بۆ نەگەڕێنرێتەوە، ئیدی دەتوانین بڵێین حەزرەت هەموو ساتێك ڕۆحی بۆ گەڕاندراوەتەوەو زیندووە وسەلامەكانی دانە دانەی موسڵمانانی سەرزەویش وەڵام دەداتەوە ..... بەواتە حەزرەت هەركاتێك پێویست بكات خودای گەورە ئیزن بە ڕۆحیانیەتی دەدات لە جەستەیەكی لەطیفی مەعنەویدا حضور (بۆ كەسانی ئیمانداری تایبەت پەیدا دەكات و پەیامی پێویست بەخۆیان وپەیوەست بەبارودۆخەكەیان پێ رادەگەیەنێ .) دیارە ئەم پەیدابوونەشی بەجەستەیەكی پێكهات لە گۆشت وپێست وخوێن و

ئێسقانی وەك خۆمان نییە، چونکە ئەگەر وابوایە پەیوەست دەبوو بە بەشی ماددیاتی ئەم بوونەوەرە و ئەو دەمەش دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی پێنج هەستەوەرە بەخشراوەکەی مرۆڤ و هەرکات پەیدا ببوایە هەموو کەس بەبێ جیاوازی بە چاوی سەر دەیانبینی، بەڵام ئەم پەیدابوونە بەچەشنێکە هاوشێوەی خیلقەت و جەستەی مەلائیکەتان وئەجینnan کەبوونیان هەیە وکەچی بۆ هەموو کەسیش نابینرێن ، چونکە ئەم بینینە هەم بەهۆی ( بصيرة =بینایی ) و، هەمیش بەهۆی چاوی دڵەوە دەبینرێن...چون خودا سێ دەزگای گرنگی چەشنی ( أذن و عين و قلب ) بە مرۆڤ بەخشیوە بۆ بیستن و بینین و لێکدانەوەی شتەکانی دەورو بەری ،کاتێکیش گەشەو نەشونما دەکەن هەم ناوەکانیان دەگۆڕێت ودەبن بە:(سمع و بصر و فؤاد )، هەم ئەرك و فەرمانەکانیشیان دەگۆڕێت ، دواشتیش کە مابێ بگوترێ ئەوەیە کە ئەم (ریسالەتی صغری) یە تایبەت نیە تەنها بە پێغەمبەران بەگشتی و پێغەمبەری خۆمان بەتایبەتی، بەڵکو خودا بە لوطف و کەرەم و بەخششی خۆی ئیزن و رێ بە ئیماندارانی گەورەش دەدات رۆحیانەتیان هامووشۆ بکاتەوە بەناو دۆستان و خەڵکیدا تا پەیام و ئامۆژگاریەکانیان پێ رابگەیەنن . کاك ئەحمەدی موفتی زادە باوەڕی بە هەموو ئەوانە هەبوو، بۆ خۆیشی کەم

و زۆر ئەم لوطفە خوداییەی لەگەڵ کرابوو و لەچەندین شوێندا بەئاشکرا باسی ئەم چەشنە لە پەیوەندی خۆی لەگەل حەزرەت کردووە و بەناڕاستەوخۆش لە هەندێ لەشیعرەکانیا ئاماژەی پێ داوە :

( کرۆ کپـخانـەی تەم گێرتەی پاییز

کەرۆ وە بەهەشـت هەناسەی ئـازیز )

بۆ (ریسالەتی صغری) ی ئیماندارانی گەورەی جگە لەپێغەمبەرانیش کاك ئەحمەد داوای لەخودا کردبوو کە ئەم شکۆمەندی و بەخشش و ڕێزلێنانەی پێ خەڵات بکات و ناوە ناوە ( یان وەك خۆی دەڵێ تاو تاوێ بگەڕێمەوە ناوتان) ڕۆحیانیەتی بگەڕێنرێتەوە لای هەندێ لە دۆستە پێگەیشتووەکانی ، تا هەم خوانەخواستە ئەگەر نادروستی و نەپێکانەك لەبیر و بینشەکانی خۆی هەبوویێت لەحاڵی ژیانیا (ڕاستەکەیان) بۆ دیاری بکات، هەمیش لەهەڵە و کەم وکورتی و نەپێکانەکانی خۆیان ئاگاداریان بکاتەوە و ڕێرەوی ڕاست و دروستیان پێ نیشان بدات .بەڕاستی کاك ئەحمەدی موفتی زادە ئەو مەردە پیاوە ئیماندارە بوو کە بە هەردوو باڵی (مەعریفە وعیرفان) ی ئایینی هەنگاوی بەرزانەی

(الى الله) ناو بەهۆیانەوە بووە ئەستێرەیەکی درەخشانی ئاسمانی ئیمان و ئیسلامەتی..

( ئەم لەدوێنیٚ پەشێوە ئەو لەسویٚ

من خەمی هیچ وپووچی ئیسامە

ئاخ کە کەمتەرخەمی و خلیسکانی

دوێنێیە ئیسە پاوەنی پـامە

گیانەکەم ئاورێکی تۆ پاسای

دوێکەم و ئیسەم و لە مەولامە )

# سەرچاوەکان

1- بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە تەواوی ئەو بەرهەمانەی کاک ئەحمەد بینیوە کە لە ( کاسێت و سیدی و نوسراوەکانی ) دەستی من کەوتوون..

2- ژیان نامە و شیعرەکانم لە دیوانی چاپکراوی ( دیاریێ بۆ یاران )ی کاک ئەحمەدی موفتی زادە دەرهێناوە..

3-بۆ کورتە ژیاننامەکەی حەزرەت(س) سوودم لە ( ژیانی ئازیزمان ) ی (حبیب محمد سعید) وەرگرتووە..

4- سوودم لە هەوڵ و ماندووبوونەکانی ( کاک کامەران حەمە سەعیدی سولێمانی ) بینیوە، چ لە گوفتارەکانی کە دوو بە دوو باسی ژیان و پەیامەکانی کاک ئەحمەدی بۆ کردبم،چ ئەو نامیلکە بچووکانەش کە گوفتاری کاک ئەحمەد بوون و خستبوونیە سەر نووسین بەناوی (تەزکیە و تەعلیم ) و ( فیطرەت و هیدایەت ) و( دڵی ساز و ناساز ) و ( چۆن و لە کوێ وە دەست پێ بکەین )..

5- هەروەها سوودم لە نووسینەکانی بەڕێز کاک ( تەحسین حەمە غەریب ) وەرگرتووە.

## سوپاس و پێزانین

- سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی سەرجەمی ئەو دۆست وخۆشەویستانەم دەکەم کە لە شکۆفەی ئەم گوڵبەرهەمەم رەنج وماندووبوونیان کێشا .
- سوپاسی (مامۆستا عبدالقهار) و (مامۆستا ئومێد) و ( مامۆستا ئاری) دەکەم کە بەکاری تایپ کردنەکەوە زەحمەتیان کێشا .
- سوپاسی (مامۆستا عبدالكريم فتاح ) دەکەم کە تێبینی جوانی پێدەدام لەسەر کتێبەکە.
- سوپاسی ( کاك توانای مەلا مەجید ) دەکەم کە رۆژگارێك ئاکار و ئەخلاقیاتی نووری پەیامەکانی کاك ئەحمەدیان تیا دەدرەوشاوەو ، بەهۆیانەوە باشتر لە رۆحی مەطڵەبی پەیامەکانی کاك ئەحمەد حاڵیی بووم و ئەم کتێبەش بەرهەمی حاڵیی بوونی ئەو رۆژگارەیە .



( موفتی زادە لە هەموو ئاکارەکانی بەرزتر وگەشتر و رۆشنتر ، مەردانە و جوامێرانەتر ، ئیماندارانە و پەیامدارانەتر ،ئەم هەڵوێستەی بوو کە نواندی بەرامبەر بە ئەوانەی کۆمەڵێکی زۆر لە دۆستانی ئازیزیان ئەشکەنجە کوژ کردو، ئەوانەش ( ٤٠) دانە لەهاورێیانی گیانی بەگیانییان زیندە بەچاڵ کرد فەرمووی : ( خوا شاهیدە نسبەت بەوانیش ڕق وکینە نیە لە دڵماو چۆن بۆ خۆم ئارەزووی ئیمان و فەزیلەت وئاقیبەت خێری دەکەم ، ئاوها بۆ ئەوانیشی ئارەزوو دەکەم )